مەسعوود محەمەد

بۆ ئەمیری حەسەنپوور لە هەر کوێیەک بێت

دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن
کۆماری عیراق، بەغدا 1984

ساڵی 1977 بۆ من ساڵێکی سیخناخ دراوی وەتەنگ هاتووی، پڕ مەشغەڵەت و سەرقاڵی بوو بەو جۆرەی نەتوان لە نووسیندا هەموو فەرمانەکانی سەرشانم بهێنمە جێ. دەبوو بەشی چوارەمی «حاجی قادری کۆیی» تێدا بەچاپ بگات، نەشگەیشت.... دەبوو لە دەرفەتدا چاو بگێڕمەوە بەو نووسراوانەدا کە لە بارستی نامیلکە و گوتار و کتێبدا پەیتا پەیتا بۆ کۆڕی زانیاری کورد دەهاتن... دەبوو لیژنەکانی زمان و ئەدەب و فەرهەنگ، کە من دەمڕاستیان بووم، هەنگاوی فرەوانتر بەرەو ئامانجەکانیان هەڵێنن... دەبوو پێوەندی کۆڕ بە جیهانی ڕۆشنبیری و قافڵەی زانستی تیژڕۆی دەروەی وڵات مەحکەمتر بێت... دەبوو گۆڤاری کۆڕ بە گوتارێکی خۆمەوە لەگەڵ دەور کردنەوەی چالاکیەکانی کۆڕ بۆ خوێنەران، هەر لە لایەن خۆمەوە، بگاتە بازاڕی خوێندنەوەی کوردی... دەبوو بێوچان وەرامی ئەو نامانە بدەمەوە کە لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات بە نیاز و خوایشتی جۆراجۆرەوە ڕوویان لێدەنام... دەبوو گەلێک «دەبووی دیکەش» مەودای ساڵ و مانگ و هەفتەیان لێم بە نیوە و سێیەک دەکرد..

قەڵەمم لە ڕووپەڕەکانی بەشی چوارەمی «حاجی قادر..» دەگێڕا کە دەستەیەک لە گەنجی خوێندەواری سلێمانی هاتن و بە نیوە تکا و نیوە ملانێ قەڵەمیان پێ لە باسی حاجی قادرەوە هەڵئەنگاوتم بۆ بەشی دووەمی «مرۆڤ و دەوروبەر». کوردی گوتەنی حوکمی حاکم لەو گەنجانەوە زۆری بۆ هێنام و لەو بارە تەنگەتاوکراوەدا بایی ئەوەی لە سنووری «بەشی دووەم» دا بگونجێ لەو «دەوروبەر» ەم نووسی، تا ئێستاش ڕێک نەکەوت بە چاپ بگات.

لە نێوان گەنجانی نامەنووس، لە دوور و نزیکەوە، دۆستێکی تازە ئاشنای کوردی کوردستانی ئێران، مامۆستا ئەمیری حەسەنپوور لە زانستگەیەکی ئەمریکاوە کە خەریک بوو شەهادەی بەرزی سەر بە زمانەوانی لێوەربگرێ، بەسەری دەکردەمەوە و لەبری نەوازشتی کە لە نامەکانیدا پێمی ڕەوا دەدیت، منیش بەپێی خوایشتی خۆی چی لە دەستم هاتبایە لە چاپەمەنی کوردی، بە تایبەتی هی کۆڕم بۆ دەنارد. جارێکیان بۆ دواین جار، بەر لەوەی پێوەندیم بە

کۆڕەوە نەمێنێت، نامەم لێی وەرگرتبێت، پاش نەوازشت و خوایشت، نیمچە لاپەڕەیەکی بە خەتی ورد بۆ نووسیبووم لە بارەی ئەو بیروڕایانەی من کە لە بەرگی سێیەمی «حاجی قادری کۆیی» هەر لە لاپەڕە 341 وە تا کۆتایی بابەتی ئەو بەرگەیان گرتۆتەوە. وا لێرەدا بەرەو خوار دەقی ئەو نامەیە بە ڕێنووسی خۆی دەنووسمەوە تاکوو خوێنەر ئاگاداری تێکڕای دوولایەنە لێکدی جوداکەی بیروڕای ئەو بەڕێزە و من ببێت.

مامۆستا ئەمیر دەڵێت:

بەڕێز مامۆستا مەسعوود محەمەد

8 ی نوامبر

دوای سڵاو و ڕێز: ماوەیەک لەوەی پێش نامەی 1977/9/20 گەیشت و زۆر بەخوێندنەوەی دڵشاد بووم. بڵاوبوونەوەی بیبلیۆگرافیای مامۆستا نەریمان – بەو زووانە – زۆر خەبەرێکی خۆشە ئەگەر هەتا یەک دوو مانگی دی بگاتە دەستم زۆری کەڵک لێوەردەگرم.

لە هاوینی ڕابردوودا خەریکی لێکۆڵینەوەی بەشێک لە ئەتروحەکەم بووم کە باسی چۆنیەتی پەرەئەستەندنی وشەو ئیستاندار بوون «یانەبوون» ی وشەی vocabulary کوردی دەکا «شێوەی سلێمانی» ئەو بەشەی ئەتروحەکە چەند باسێکی تێدایە وەک.

1- جێگەی وشە لە پەیدابوونی زمانی نەتەوەییدا.
2- سەرچاوەی وشەی زمانی کوردی.
3- پرۆسەکانی process وشە دانان لە کوردیدا (دروست کردنی اسم، فعل، سیفەت و.... ).

4- فەرهەنگ نووسینی کوردی (فەرهەنگ نووسین لە پەرەئەستەندن و ئیستانداردبوونی کوردیدا چ جێگەیەکی بووە؟).
5- ئیستانداردبوون «یان نەبوون» ی وشەی کوردی.

لە مانگی ڕابردوودا خەریکی باسی «ع» بووم و ئێستە خەریکی نووسینیم.

بەعزە سەرچاوەیەک هەن کە بیستوومەو تا ئێستە نەم دیون:

- مەعروف قەرەداغی فەرهەنگی کشتوکاڵ بەرگی 1 و 2، 1972 بەغدا.
- عەبدولقادر بەرزنجی فەرهەنگی زانیاری سلێمانی 1971.
- جەلال غەریب فەرهەنگی زانیاری عەرەبی– کوردی ب 1- 2، سلێمانی 1974.
- پەروەردەو زانست 1974 ژمارە 7-8، 1974 ژمارە 4.
- پەروەردەو زانست 1973 ژمارە 4، کوردی- عەرەبی.

زۆرم پێخۆشبوو ئەوانەم وەدەست کەوتبا یان هەر نەبێ ناوەڕۆکی ئەو کتێبانەم بۆ ڕوون بووباوە.

هەروەها ئەو نووسراوانەی خوارەوەم لێرەو لەوێ لە بڵاوکراوەکانی کوردا دیوە «ناونیشانەکانی!» کە هەموویان نووسراوی د. ئاورەحمانن. ئەگەر وەگیر دەکەون تکایە بۆم بنێرن..

- «چالاکی مامۆستا گیوی موکریانی لە مێژووی فەرهەنگ نووسینی کوردیدا» هاوکاری ژ. 100-104، 1973.
- «فەرهەنگی خاڵ» هاوکاری ژمارە 19-23، ساڵی 1971.

- «چەند ڕوون کردنەوە بەڵگەو تێبینیەکی نوێ دەربارەی فەرهەنگی خاڵ» هاوکاری ژمارە 105-108، 1973.
- «چەند سەرنجێک دەربارەی زاراوەی پارێزگای سلێمانی» هاوکاری، 1973، ژمارە 151-153.
- «فەرهەنگی خاڵ» هاوکاری ژمارە 105- 108، 1973.
- «فەرهەنگەکەی مامۆستا جگەرخوێن» هاوکاری ژمارە 137-138، 1973.

پارەکە نامەم نووسی کە هاوکاری چەند ڕۆژنامەی ترم بۆ بنێرن، بەڵام وەڵامم بۆ نەهاتەوە.

بە داخەوە هێشتا ناتوانم لەسەر تەواوی بڵاوکراوەکانی کۆڕ بیروڕای خۆم دەرببڕم چونکە هێشتا هەموویانم بەتەواوی نەخوێندوونەوەو وردە وردە خەریکیانم. چاپ کردنەوەی مەتنەکانی توحفەی مزەفەرییە، ئەو کتێبەی (کە نایاب بووە) بە قاڵبێکی تازە خستەوە بەردەستان و لەو بابەتەوە کارێکی زۆر باش بوو.

بەڵام پێموایە «پێشەکی» مامۆستا هێمن لە بڵاو کردنەوەی کتێبەکە گرنگترە- چونکە بۆ یەکەمجار باسێکی گرنگی باوو بەیت گوتنی کردووەو بەعزە لایەنێکی کۆمەڵایەتی ئەو هونەرەی ڕوونکردووەتەوە. جا بۆیە بە بیروڕای من ئەگەر مامۆستا هێمن خەریکی ئەو جۆرە نووسینە بێ (وەک ئەوەی لە سەرەتای «تاریک و ڕوون» نووسیویەتی) کارەکەی کەڵکێکی زۆر گەورەتری دەبێ.

هەروەها بیروڕای خۆم لەسەر بەشێک لە «حاجی قادری کۆیی» (تەنیا لاپەڕەی 341 تا ئاخری بەشی سێ) دەردەبڕم ئەوە هەوەڵ جارە کە بە کوردی باسی فئودالیسم لە کوردستان دەخوێنمەوە. ئەو باسە لە چاپەمەنی

کوردیدا زۆر تازەیەو هێشتا پێویستی زۆر بە لێکۆڵینەوەی مێژویی و تئوری هەیە. لێرەدا باسی مەسەلەیەکی تئوری دەکەم کە پێم وایە لە باسەکەتدا ئەسەرێکی تەواوی هەیە: لە لێکدانەوەی نیزامێکی ئابووری – کۆمەڵایەتی وەک فئودالیسم یان کاپیتالیسم و .... پێویستە ژێر بەنا base یان infrastructure لە ڕوبەنا superstructure جیابکەینەوە هەروەها لە لێکدانەوەی تەتبیقی فئودالیسم (لە چەند وڵاتدا) پێویستە ڕوبەناو ژێربەنا تێکەڵ نەکەین. ئەوە لە باری تئورییەوە، لە باری فەلسەفیەوە ئەوە بەو مەعنایەیە کە عەرز و ماهیە تێکەڵ نەکەین. بۆ وێنە ماهیە (ژێربەنا) لە فئودالیسم ئەوەیە:

مولکیەتی زەوی (وەسیلە بنچینەیی انتاج) لە لایەن دەرەبەگەوەو چەوساندنەوەی جووتیار کە بەستراوەتەوە بە دەرەبەگ. ئەوەیە فئودالیسم- چ لە کوردستان چ لە یابان و چین و هندو فەرەنساو ئینگلتەرەوە. ئەمە ماهیەتە، ئەوانی تر- هونەر، ئەدەبیات، خانووبەرە، .... هەموو عەرزو ڕوبەنان و کۆمەڵ بە کۆمەڵ جیاوازی هەیە. بەڵام دیسان ئاشکرایە کە هونەرو ئەدەبی فئودالی فەرەنسا زۆر تر لە هونەرو ئەدەبی فئودالی ئینگلیزو یابان... نزیکترە تا لە هونەرو ئەدەبی سەرمایەداری ئێستای فەرەنسا. جا ئەمن پێم وایە لە باسی فئودالیسمدا مەسەلەی فئودالیسی کورد دەبێ لەسەر ئەساسێکی تئوری لێکبدرێتەوە. لە باری سیاسیەوە تەناقوزی نێوان چینی دەرەبەگی کوردو دەرەبەگی بێگانە نابێ لەگەڵ تەناقوزی نێوان گەلی کوردو دوژمانی تێکەڵ بکرێ- بەتایبەتی لە ئاخرو ئۆخری قەرنی 19 ڕا تا ئێستا (لە قەرنی 16 و 17را ئەو دوو تەناقوزە تا ڕادەیەک تەتبیقیان هەبوو، بڕوانە لێکدانەوەی احمد خانی لە بارەی وەزعی ئەو زەمانی وڵات). جا ئەوە زۆر بە کورتی بیروڕای منە سەبارەت بەو باسە. ئومێدم وایە لەو چەند دێڕەدا توانیبم بیروڕاکەم بە ڕوونی دەربڕیبێ. ئەگەر پێویستە دەتوانم لە داهاتوودا زۆرتری لەسەر بڕۆم.

ئەو ڕۆژانە چاوەڕوانم ئەو کتێبانەی لە 2/ 9/ 1977 دا لە لایەن کۆڕەوە ناردراوە بگاتە ئێرە- بەتایبەتی چاوەڕوانی دیتنی «وشە ڕۆنان لە زمانی کوردی» و «دیوانا مەلای جزیری» و «ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا» و «چەند حەشارگەیەک..» م.

لەگەڵ ڕێزو سۆزێکی زۆر

ئەمیر

ئەم نامەیە لە 8 ی ئەیلوولی 1977 نووسراوە و وەک لە بیرمە لە دوا ڕۆژانی هەمان مانگدا بە من گەیشت.

زۆرم پێناخۆشبوو ئەو تێبینیانەی وەها گەرموگوڕ لە تازە دۆستێکمەوە، لە پەردەی زەینمدا بەدیار وەرامی منەوە ئەبڵەق بمێننەوە، بەلای خاوەنەکەشیانەوە وەک تیری بێ ئامانج بەرەو بۆشایی، نە دەنگێک نە ڕەنگێک نەدەنەوە.

تانووتم دایە خۆم و سواری شانی بێ دەرفەتیم بووم:

چەند شەوێکان لە سەعاتە ناوەختەکانی نزیک بەیانیدا نیمچە سیپارەیەکم درشتنووس کرد، بەڵام بەر لەوەی بتوانم لێی ببمەوە، بە ئومێدی هەلێکی لەبارتر لەگەڵ نامەکەی ئەمیردا خستمنە گۆشەیەکەوە و.... هەرێک پاڵەپەستۆی مەشغەڵەتی ڕۆژانە لەبیرمی بردنەوە و بزریشم کردن بەوەدا ڕێگەی وەرامدانەوەیەکی دیکەشم لێداخرا چونکە دەقی قسەکانی کاک ئەمیر لە نامەکەدا چەسپ بوو نەک لە مێشکی من.

پتر لە چوار ساڵ بەسەر ئەو ڕێکەوتەدا تێپەڕی تاکوو ڕۆژێکیان لە هێکرا، نامەی هەرام، بێمەبەست و بێتەکبیر کڵاوی سەخرەجنی داڕنی و لەبەر دەستانم قوتبۆوە- سەد جاران دیمانەی بەخێر. منیش توند دەستی بەخیلیم لێ قایم کرد کە ئیتر چاوشێرکێم لەگەڵدا نەکات و چیدیکە بۆ بزربوونی پەنجەی ئەفسوس نەشکێنمەوە.

بەڵام ڕێکەوتێکی لەو دۆزینەوەیەی بێتەکبیر سەیرتر ئەوەبوو کەوا هەرچەند سیپارۆکە باسکراوەکەی لەگەڵدا نەبوو، خواوڕاستان، چەند لاپەڕەیەکی پێشەکیەکەی بەشی چوارەمی «حاجی قادری کۆیی» لەخۆوە بێ ئەوەی مەبەستی من بووبێت، بەجیرانەتی نامەکە لەو چوار ساڵەدا سەریان نابۆوە. ئەوانیش لە غەیبەوە کەوتنە ناودەستی بەتاڵ و بێ تەمامەوە، دیمانەی

ئەوانیش بەخێر. یەکەم تێڕامانم لەو ڕووپەڕانەدا، هەر لە تروکەیەکدا، پێی سەلماندم کە دەشێ ببێتە پێشدەستی بۆ وەرامی نامەکەی کاک ئەمیر چونکە کە لە بەرانبەر یەکدی ڕابگیرێن وەک «کامێرا و وێنە» لەیەکدی ڕادەمێنن ئیتر وێنەکە نێگاتیڤ بێت و کامێراکە دروستی بداتەوە، وەیا ئەویان دروست بێت و ئەمیان بیکاتەوە بە نیگاتیڤ، لە لایەن کات و باری بەوەلەدبوونیشەوە هەردوویان بێچووی یەک ساڵن، ئەگەر هی یەک مانگ نەبن. وا لێرە بەدواوە ئەو چەند لاپەڕەیە دەکەم بە هەوەڵ «علیک» بۆ سڵاوی نامەکەی مامۆستا ئەمیر دواتر میوانداری تەواوی لێدەکەم:

لاپەڕەکان بە شێوەی خوارەوە دەدوێن:

بەشی چوارەم
حاجی قادری کۆیی

پێشەکی

باسی حاجی قادر بەو شێوەیەی منی بەخۆیەوە خەریک کرد هەموو ئەو بەرتەکانەی(1) بە تەمایان بووم لێی هاتنە دی. زۆرینەی هەرە زۆری خوێنەری کورد بەپێی ئەو واقیعەی دەوری لێداون و کولانەی تێوەڕامانی لەبەر چاواندا کردونەتەوە، یەک نیگایان لێبۆتە ئەو دووربینەی سەیری بیروڕا و چاکە و خراپە و کۆمەڵایەتی و مێژووی پێ دەکەن ئەویش دووربینی ماددی جەدەلی و مێژوییە. ڕەنگە گومان لەوەدا نەبێ کەوا بەر لە نووسینە شەل و پەلەکانی من هیچ نووسینێکی دیکەی کوردی ئەو ئەرکەی نەکێشاوە پرسەکێک (2) بهاوێتە پێش هیچ یەکێک لەو باسە فەلسەفییە- ئابووریە- کۆمەڵایەتییە- مێژوویانەی کە لە بیری ماددی جەدەلی سەریان هەڵداوە و بۆ ماوەی سی ساڵی ڕابردوو سەرانسەری ئاسۆی ڕۆشنبیری و ڕامیاری فکری نەوباوی کوردەواری گرتۆتەوە.

هەڵبەت من کە لە ساڵی 1972 دەستم دایە نووسین ئەم ڕاستیە یەکجار گرنگەم لێ ڕوون بوو، هێندەش بەلامەوە ڕاستیەکی بنجی و ڕەگداکوتاو بوو، دڵی خۆم بەوە دابین کردبوو کە لە ئاست نووسینە نەسەلمێنەکانی خۆمدا بە تەمای دۆست و برادەر و یاریدەر و پشتیوان نەبم لەو ڕووەوە کە دەمزانی کوردەواریی خۆمان جێی هیچ بیروڕایەکی تێدا نابێتەوە ئەگەر لەسەر تەلی ماددی تەقلیدی لێنەدات.

هەر هەمان نیگای دروستبین، بەلای خۆمەوە، قەناعەتێکی دیکەشی پێ پەیداکردبووم لەوەدا کە ناشێ بڕیارە یەک جۆرە فەلسەفیە گشتیەکانی فکری

ماددی لە دوو واقعی جودا و پێچەوانەی یەکتردا بەڕاست بگەڕێ: هەروەک فکری ماددی ناسەلمێنێ عەبد و خاوەنەکەی، عەمەلە و پارەدار، ڕەنجبەر و موڵکدار، قەرزدار و سوودخۆر بخرێنە بەر یەک یاسا و دەستووری دادی کۆمەڵایەتییەوە، منیش هەقمە نەسەلمێنم میللەتی کورد و داگیرکەرە کۆنینەکانی باربەری هەمان بۆچوون و قەناعەت و دەستوورانی فەلسەفەی ماددی بن کە بە نیگایەکی درشتبینی ئەوتۆوە سەیری هەموو مێژوو دەکات ناتوانێ حسابی ڕاست و دروست بۆ جودایی نێوان قۆناغە مێژووییەکانی میللەتی کەرت کەرت و ژێردەست لەگەڵ میللەتێکی دیکەی زاڵی یەکگرتوودا بکات. وادیارە، بە عادەت، دانەری نەزەریەی سەر بە کۆمەڵایەتی- ڕامیاری لە پێناو لووس و لێکی و بێگرفتی و پەراوێزفرەوانی پەکی بەوە ناکەوێ میللەتی بێهێز و کەم سامان و دابەش و زۆرلێکراوی وەکوو کورد دەکەوێتە ژێر ئەو بڕیارانەی کە لە نەزەرەیەکەیدا بەسەر میللەتێکی دەسەڵاتدار و یەکگرتووی داگیرکەردا دەهێنرێت. بە زۆریش دانەری ئەو نەزەریانە بۆ خۆی تاکێکی میللەتی دەسەڵاتدار و پێشکەوتووە، بۆیە بە درنگەوە دەماری بەزەیی بەخەبەر دێت و لە کوێرەڕێگا و لاڕێیەکانی نەزەریەیدا حاڵ و باری میللەتی زەعیف تێدەخوێنێتەوە و بۆرە حسابێک بۆ زەرفی تایبەتی ئەو دەکات.

بێگومان ئەگەر دانەری نەزەریەی مێژوویی و ڕامیاری و ئابووری لە واقیعی میللەتێکی کەرتکراو و هەژار و دەست بەسراوە هەوەڵ بەردەکانی بناخەی بیروڕای خۆی هەڵبنێت پتر بە حسابی تایبەتی ئەو جۆرە میللەتانەوە خەریک دەبێت، ئەوساش ڕۆشنبیر بە ویژدانێکی حەسایەوەترەوە پشتگیری لەو بیروڕایە دەکەن چونکە کە بیروڕا لەسەر بنەمای مافی میللەتی ژێردەست و لێقەوماو هەڵستابێت لزووم بەوە نامێنێ هەر جارە لە پشت گوێ خستنی میللەتی کەم دەسەڵاتدا عوزر و بەهانەی «قوربانیدانی بچووک لە پێناو سوودی گشتی ئادەمیزاد» وەک پەردەی درۆزن بەسەر هەڵوەستی هەلپەرستدا بکێشرێت.

[تۆ بڵێی بشیابا لە کوردستانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمدا بانگەوازی «ئەی کرێکارانی جیهان یەکتر بگرن» بەرزبێتەوە کە ئەوسا، جارێ کرێکاری ناو بانگەوازەکە لە کوردستاندا بە خەیاڵاندا نەهاتبوو، چ جایی پەیدا بووبێت؟] — ئەم چەند دێڕەی ناو کەوانەم لە نووسینەوەدا تێچێن کرد.

خواستنەوەی چاویلکەی میللەتی بەهێز لە لایەن میللەتی بێهێزەوە بۆ تەماشا کردنی کۆمەڵایەتی و مێژوو کە لە جێگە و کاتی جودادا سەری هەڵداوە وەک خواستنەوەی چاوی دەوڵەمەندە لە لایەن هەژارەوە، ڕەنگە هێشتاش لەم حسابەدا هەژارەکە کەمتر غەدری لە خۆی کردبێ چونکە دەشێ ڕۆژەک لە ڕۆژان، لە بەشینەوەی گۆشتی سەدەقە وەیا لە داوەت و پڵاولۆغانێکدا بابای هەژار لوقمەیەکی دەوڵەمەندەکەی پێ بگات، وەیا لە تەقلەی زەمانەدا حاڵ و بار و سامانێکی بۆ ڕێک بکەوێ. بەڵام وەک دەزانین میللەتی فەقیری کورد ئاسایی لە وەهم و ورێنەشدا ئەو تەرزە هەڵکەوتە خۆشانە بەخۆیەوە نابینێ. لەبەر ئەمە کە گەنجی کورد دێت و لە مێژوودا کوردەواری بە ئەڵمانەواری و ڕووسەواری و فرەنگەواری دەگرێ و جلکی کۆمەڵایەتیی ئەوانی لەبەر دەکات و بە کێشانە و پێوانەی ئەوانی هەڵدەسەنگێنێت هێند لە میللەتەکەی پشترێ دەبێ و وەها خۆی لێنەناس دەکا هەر دەڵێی «خەمیس ئەفەندی» یەکەی شیعری شێخ ڕەزایە کە لە چەند بەیتێکدا شکات لە دەست خۆلێنەناس کردنەکەی دەکات:

خۆی کرد بە تورک و لێمی خوڕی «کیم بلر سزی»؟
پێم گوت: من فڵانە کەسم مامە شێخ ڕەزام
تانمز میسن «خمیس افندی» مگر بزی

بێ لە گەمە، هەر جارە کە دەبینم نووسەری کورد لەسەر ڕووی کاغەز و بە نووکی قەڵەم ڕاپێچەک دەدا بۆ نێو چغزی میللەتان و بەندوباڵۆرەی خۆشکەڵەی مرۆڤنەوازی و یەکسانی و برایەتی و هاوڕێیی و ئەو تەرزە ئاهەنگە خەولێخەرە و سەرگورشتە چەور و لووسانەی ڕاماڵ بنەگوێیان دەکات بە دەست خۆم نییە، لەو پەڕی سەیر پێهاتنەوە وەک کە بەدوا حەیراناندا «توای هوو» ی لێدەکێشن منیش بەدوای ئەو قسە لۆق و لۆقاوییە شاش و بێشانەدا لەبەر خۆمەوە دەڵێم:

توای هوو!! براله، هەمزە لە عەبباسی چی؟ جەنابی «خەمیسە ئەفەندی» بە زمانێکم لەگەڵدا بدوێ تێت بگەم. من مامە کوردە کەنەفتە پڕزۆڵەکەی چەند هەزار ساڵیم، لە فەرمایشتە زرنگەدارە بەگزادەکانت بەڵەد نیم واز لە ساز و ئاهەنگی فەرەنگ و چین و ماچین و کەمەرچین بهێنەو وەرە لەسەر بەردە ڕەقەکەی نێو هۆ و پارچە هەرزنەی لەگەڵم هەڵتووتەکێ بە ئەزمانی مام لالۆ و خاڵ پیرۆتان لەو گێلمە گێلمە و تورکەتورکەم دەربازکە..

بەڕاستی ئێمە کە دێین وەک وێنەگری هونەرکار لە پەنا زاراوەی زانستی و ڕستەی ڕەوانبێژانە و بۆچوونی فەلسەفییەوە خۆمان لە ژیانە یەکجار دواکەوتووە سافیلکە ڕووت و ڕەجاڵەکەی میللەتی هەژاری کەنەفتی وەک کورددا دەنوسێنین و باڵا هەڵقرچاوەکەی دەدەینە بەر ئەو نیگایەی کە دەیبڕینە باڵای پۆشتە و پەرداخان، هەر دەڵێی ئەو ئەندازیارە خەیاڵ بڵاوەین کە دێت زنج و کۆختە شڕە سەرانگوێلکاویەکانمان لە دێیە نیوە وێرانەکانماندا بە پەرگار و کۆنیا و شاقوڵ تاقی دەکاتەوە... هەروەک ئەو زنجە شڕانە یەک تاکە بستی بنمیچ و دیوار و دەرگەی لەسەر حساب هەڵستاویان تێدا نییە پەرگار و کۆنایان لەسەر بگەڕێ، میللەتی زەلیلی وەک کوردیش هیچی بەبەرەوە نییە لایەق بێت بخرێتە بەر حوکمی ئەو نەزەریە و بۆچوونانەی لە میللەتی بە هێز و پێز هەڵدێنجرێن. ئەندازیار ئەگەر بە چاوی خۆی زنجە شڕەکان ببینێت، بیر لە کۆنیا و پەڕگار ناکاتەوە، بەڵام کە پلانی زنجەکانی بۆ

خرایە سەر کاغەزی لووسک و لێک هەموو ئامرازەکانی تاقمی قوتووی ئەندازەیان لەسەر دەگێڕێ و بە سانتیمیان دەپێوێ، هەڵبەت هیچ کامێکیش لەو ئامرازانە لەسەر ڕووی کاغەز کرچ ناکات. نووسەریش وەک ئەندازیار ئەگەر بێت و واقیعە هەژارە لە حساب بەدەرەکەی میللەتی کورد بە هۆش و گۆشی ئازادی خۆیەوە بگرێ بەدڵیدا نایێ پەرگار و کۆنیای ئەو فەلسەفانەی لەسەر بگێڕێ کە لە واقعێکی زێدە پێشکەوتووی وەک ئەورووپا هەڵێنجراون، بەڵام کە ناوی کوردی لە نووسیناندا هاتە بەرچاوو لە تەک ناوی میللتی دیکە سەری پێداگرت دیمەنەکەی لێدەگۆڕێ و جوداوازییە زلەکانی نێوان میللەتی کەنەفت و هی تێر و تەسەلی بەسەر چاواندا دەکشێت، هێندەش بێ گرفت و کۆسپ خلیسک دەکات هەست بە خۆی ناکات، هێندەش زیهنی ئاخنراوە بەو فکر و فەلسەفانەی کە هەموو میللەتان دەدەنە بەر یەک لێکدانەوە و یەک کێشانە و پێوانە زۆر بە زەحمەت دەتوانێ بیر لە هەبوونی جوداوازی نێوان میللەتان بکاتەوە یان ببڕای ببڕای بیری لێناکاتەوە لە لای خۆشیەوە ڕاستیەکی ئەوەندە گەورە و ئاشکرای پێکاوە دەمەتەقە هەڵناگرێ. بەڵام هەمان نووسەر کە دەبیەت ئاینێکی وەک ئیسلام بە خەڵک ڕادەگەیەنێ برا بن و ستەم لە یەکدی نەکەن دەرحاڵ دەنگی ڕەخنە و بەرهەڵستی هەڵدەبڕێت و دەڵێت: چۆن دەشێ هەژار و دەوڵەمەند وەکوو یەک حساب بکرێن؟ تەنانەت بە جۆرێک جودایی نێوان چینەکان دەکاتە دیواری هەڵاواردن و لەیەکدی ترازاندن هەر دەڵێی ڕۆژەک لە ڕۆژان ئەو خەڵقە مەرحەبایان لە یەکدی نەکردووە، خۆ ئەگەر فەقیرەکە بەپێی تەعلیماتی نووسەرەکە بەگژ واقیعدا نەچێ خێرا مۆری خیانەتی چینایەتی لێدەدات. دەبێ چینەکان وەها بەشەڕ بێن کە ئاشتبوونەوە هەڵنەگرێ: شەڕی نێوان چینەکان بەلای ئەو باوەڕەی کە هەموو میللەتان بە یەک نیگا سەیر دەکات تەنیا بە تێچوونی چینەکانی سەرووی کۆمەڵایەتی کۆتایی قبووڵ دەکات، تێشت ناگەیەنێ ئایا ئەو تاقمەی لە حوکمڕانیدان دەبنە جێگری تاقمی پێش خۆیان چۆناو چۆنی تەرخان دەبن بۆ خزمەتگوزاری میللەت بێ

تۆقاندن و بێ دەستدرێژی، لە حاڵێکدا هەرچی ئامێری دەربڕینی دەنگی ناڕەزایی هەیە لە میللەت حەرام دەکرێ. نەسەلماندنی لەسەر بەخیانەت دەژمێردرێت!!

هەر ئەم نیگایە سەر لەبەر و سەرانسەریشە وەها لە خاوەنەکەی خۆش دەهێنێ کورد و ژاپۆن و فەرەنگ... و هەموو جیهان یەک کێڵگەی بێجەمسەری یەکچوونی ستەم و داد بن... ڕەنگە لە ئاست ئەم تێبینیانەمدا بگوترێ تەماشا کردنی هەموو میللەتان بە یەک نیگا کە دەکێشێتەوە سەر بەشەڕهێنانی چینەکان بە نیازی بڕاندنەوەی تۆی «چینی چەوسێنەرەوە» لە تاکە سەرچاوەی مرۆڤدۆستیەوە هەڵدەقوڵێ لەو ڕووەوە کە یەکچوونی و یەکسانی میللەتان لە گۆشەنیگای کۆمەڵایەتی و مێژوویی بەرفرەوانی مرۆڤەوە زووتر و ئاسانتر و کاریگەرتر یاریدەی تێکرای چینە هەژارەکان دەدات بۆ خۆڕزگار کردنی یەکجارەکی لە ستەمی تێکڕای زۆرداران کە بریتین لە چەوسێنەرەوەکان.

لە پێشەوە دەڵێم ئەم بۆچوونە تەنها لە حاڵێکدا ڕاستی دەکرد کە هەموو جیهان بریتی بوایە لە یەک دەوڵەت و یەک میللەت: هەر جیهان بکە بە دوو دەوڵەت بۆچوونەکە دەبێتە خەیاڵی، وەیا بیکە بە دوو میللەت بۆچونکە دەبێتەوە خەیاڵی، چونکە لە هەردوو باردا دوو دەوڵەتەکە و دوو میللەتەکە وەها لە یەکدی جودا دەبنەوە نەشێ یەکچوونی لە نێوانیاندا هەبێ.

بیر کردنەوەی وەها سەراوی پاشماوەی خەیاڵە خۆشکەڵەکانی بەر لە سەد ساڵە، لە زۆر شوێنی پێشکەوتووشدا دەمێکە ئیفلاسی کردووە [دەشبوو لە سەرەتاوە گەشە نەکات] و وازی لێهێنراوە چونکە بە چەند تەجرەبەیەکی سەرەتایی خەباتی میللەتان ئاشکرابوو تێک بەستنی فەرەنسا و ئەفغان بەیەک زنجیرەی فەلسەفە و خەبات وەک هەڵکێشانی تەرازوویەکە کە دەستەیەکی بەتاڵ بێت. ئەم ڕاستیەش لە نێوان هەموو ئەو لایەنە شۆڕشگێڕانەی کە

ڕابەرایەتی بزووتنەوەی بەهێز و پێشکەوتوو دەکەن سەلمێنراو و لەکار هێنراویشە، هەربۆیەشە نایەن خۆیان لە میللەتی تێکشکاو ببەستنەوە، بەڵام بەپێی هێز و پێشەوایەتیەکی لە دەستیان دایە داوا دەکەن میللەتی دیکە بەرژەوەندی خۆی لە هی ئەوان گرێ بدات بە مەرجێک کە ئەگەر تێکبەستنەکە لەسەریان گران کەوت بتوانن لەلای خۆیانەوە گرێی پێوەندیەکە بکەنەوە و خۆیانی لێ ڕەها بکەن… ڕاستیەکەی ئەم مامەڵەتەش هەزاران ساڵە لە لایەن دەسەڵاتدارەوە بۆ سوودی خۆی بەسەر بێدەسەڵاتدا هێنراوە، کە هەمیشە بەرژەوەندی بەردەستەکانی لە بەرژەوەندی خۆی بەستووە. دەمەوێ بڵێم مامەڵەتەکە هی زێدە زەکای فەیلەسوفەکانی ئەم سەردەمە نییە.

بێگومان لەیەکنەچوونی میللەتی هەژار و ساماندار بەرچاوترە، گەلێکیش بەرچاوترە، لە لێکنەچوونی تاکی هەژار و تاکی دەوڵەمەند، ئەم ڕاستیەش لەوانە نییە نەیەتە بەر نیگای مرۆڤی زیرەکی هۆشیار و زانای وەک ئەوانەی لە سەدەی نۆزدەمدا بنەمای تیۆری مادديان هەڵدەنا. بەڵام وا پێدەچێ ئەو زانا هۆشدارانە بە ئومێدی ئەوەبوون چینە هەژارەکان لە هەموو جیهاندا بە زوویی پەندی برایەتی و هاوخەباتی و هاوبەرژەوەندی لە فەلسەفەکەی ئەوانەوە فێرببن و لە ماوەیەکی مەیلەو کورتدا سوودی مشتەرەک بەرەو خەباتی یەکگرتوویانەوە ببات، بە تایبەتی پرۆلیتاریای ئەورووپای ڕۆژئاوایی کە بەلای نەزەریەی مادديەوە نێرتکی بزووتنەوەی چینایەتی جیهانی بوو، نەزەریەش خۆی بەوە ئیقناع کردبوو کە گەیشتنی عەمەلە بە حوکم لە وڵاتی پێشکەوتووی ڕۆژئاوادا بڕیاری مێژووە، ئیتر هاتنی ئەو ڕۆژە مەوعودەی ڕمانی چەوساندنەوە کە لە «مسلمات» ی نەزەرەیەکە بوو وەهای دەکرد وردپێویی نەکرێ لە جودازی پلەی گۆڕانی میللەتەکان: وا دەرگەی بەهەشت خەریکە دەکرێتەوە، چ لزوم هەیە بە هەڵواردنی بلوجستان لە ئەلمانستان!

نا واقیعیەتی ئەم تەرزە لێکدانەوەیە خێرا بە خێرا بۆ زۆر کەس دەرکەوت، خۆی لە جغزی هەڵوەستی «ڕەسمی» دا هەر بە دامەزراندنی یەکەم دەوڵەتی «پرۆلیتاریای هەژاردۆست» لە هەوەڵ تێکەڵبوونیەوە لە سیاسەتی نێوان دەوڵەتان قسە ڕۆیشتووەکانیان کەوتنە سەر باری خۆ جودا کردنەوە لە یۆتۆپیای بزووتنەوەی یەکگرتووی هەژارانی جیهان، ئیتر هەموو هەوڵ و تەقەلایان ڕووی لە تاکە ئامانجی پاراستنی دەوڵەتەکەیان کرد. دەشبوو هەر وەها بکەن دەنا بێ ئەوەی بتوانن چی ئەوتۆ بزووتنەوەی جیهانی هەژاران بەرەو پێش ببەن دەوڵەتەکەیان لێ هەڵدەوەشایەوە. بەڵام ئەم خۆدزینەوەی ژیرانەیان لە چارەنووسی هەژارانی جیهان بە نیازی پاراستنی خۆیان نەیخستنە سەر باوەڕی دەروێشانەی دڵپاکانەی ڕەفز کردنی خەباتی غەیری خۆیان بۆ خۆیان: هەروەک پاراستن و سەلامەتیی دەوڵەتەکەیان لە چارەنووسی هەژاری وڵاتی دیکەی دابڕین هەروەها هەمان ئامانجی «خۆپارستن» وای کرد جانفیدایی هەژاری جیهان بۆ خۆیان قبوڵ بکەن. ئەم ڕووپەڕەیەش لەگەڵ پێچانەوەی قۆناغی شەڕی دووەم و پتر ڕوونبوونەوەی لایەنە خەیاڵیەکانی ئەسڵە فەلسەفەکە، وردەوردە، بەرەو پێچرانەوە بۆوە تاکوو دەیبینین لەم ڕۆژگارەدا ژمارەیەکی زۆر لە حزبە شیوعیەکان خۆیان دەدزنەوە لەو جانفیدایی و قوربانی دانە یەکلاییەی جاران دەیانکرد بۆ تاکە دەوڵەتی شیوعی ئێستا خۆیان بەو دەگرن.

ڕوونبوونەوەی جوداوازی بزووتنەوەی «چەپ» لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێک تا ئەو ڕادەیەی بەگژ یەکدیدا بێنەوە هیچ عوزری بەدەست مرۆڤی چاوساغەوە نەهێشت لەوەدا هەر سووربێت لەسەر هاوچوون کردنی ڕابردووی میللەتان بێ تێخوێندنەوەی جودابوونی حاڵ و باری ئەو میللەتانە هەر لەبەر خاتری دانەلەنگانی ڕێز و پایەی فەلسەفە. چەند سەیرە فەلسەفەیەک بریتی بێ لە وشە و فکر کە هیچیان ڕۆحیان لەبەر نییە تاکوو پەکی بە دڵدانەوە کەوتبێ خاوەن فەلسەفەکەش هێند لەمێژبێ مردبێ کە ئەگەر باوەڕی بە رۆح هەبایە ڕۆحەکەی کەوتبێتە سەر بارێک ئەویش پەکی بە دڵدانەوە نەکەوێ، ئا ئەو

فەلسەفەیە و خاوەنەکەی ڕێزلێنانیان لەوەدا بێت ڕابردووە یەکجار لەیەکتر جوداکانی میللەتی بەهێز و بێ هێز وەکوو یەکدی بخرێنە ژێر حوکمی ئەو بڕیارانەی کە ئەرکی قورس دەخەنە سەر میللەتی بێهێزی ئەوتۆ هەتا بڵێ موحتاجی دڵدانەوەیە.

پێشەکیەکەی «حاجی قادر..» لێرەدا کۆتایی دێت.

بچینەوە بۆ نامەکەی مامۆستا ئەمیر.

لە شێوەی نووسینەکەی ئەو بەڕێزەوە دیارە نەیویستووە پاتەوپات پێم بڵێ شی کردنەوەی کۆمەڵایەتی بەو جۆرە ڕەمەکیەی کە لە بەشی سێیەمی «حاجی قادر..» دا کراوە جایەز نییە. لەوەدا سپاسی دەکەم، بەڵام پێم خۆشە لێم بسەلمێنی کە من دێم لە گۆشەنیگای خۆمەوە سەربە کۆمەڵایەتیی زێدە مەفهومی کورددا دەگرم لە پێشەوە ئەو شی کردنە «زانستی» یانەی بە عادەت هانایان دەبرێتەبەر لای من ئیفلاسیان کردووە تا ئەو ڕادەیەی ناتوانم بەهیچ جۆرێک نە ژوورخان نە ژێرخانی کوردەواری ڕوون بکەنەوە و نەتەفسیری ژوور خانەکە لە ژێر خانەکە هەڵێنجن، ئەو شی کردنەوانەی ناویان بە علمی ڕۆیشتووە هەر لەوەندەدا دەتوانن ڕاست دەربچن کە میللەتان وەکوو بووکەشووشەی کۆککراو لە سندووقچەی ئەوانەوە دەربێنن و بە سازی ئەوان بڕەقسن بە تەواوی وەک مەفهومی ڕوباعیەکی خەیام کە دەڵێ:

ما لعبتگانیم و فلک لعبت باز
از ڕوی حقیقتی نه از روی مجاز
بازیچه همی کنیم بر نطع وجود
رفتیم بصندوق عدم یک یک باز

تەنها فەلەکەکە بگۆڕە بە فەلسەفە لێکچوونەکە تەواو دەبێ. دەمێکی لە مێژەوەیە بەوە ڕاهاتووم لە گلێنەی چاوی خۆمەوە سەیری کۆمەڵایەتی و مێژوو (زۆرجاران زانستی تەتبیقیش) بکەم نەک لە عەدەسەی چاوی نەزەریانەوە. منیش و تۆیش و هەموو ئەو عەمر و زەیدێکیش دەبێ نەزەریە و خوێندن و تەجرەبە و تێوەڕامان و بیستن و دیتن یاریدەی ڕوونایی بینینمان بدەن نەک لێمان ببن بە عەینی بینینەکە. من کە بە چاو لە شوێنێکدا ماسی زیندوو ببینم و ئاوی تێدا نەبێ دەرحاڵ ماسیەکە بە درۆ دەخەمەوە چونکە ماسی بێ ئاو ناژی چجای ئەوەی بە دووربینی نەزەریە ئەو ماسییە زیندووە لە جێگەی بێ ئاودا ببینم و بڕوا بە دیتنەکەم بکەم. جۆرج برنادشۆ لە پێشەکی چیرۆکی *The Devil's Disciple* «شاگردی شەیتان» بەر لە هەشتا ساڵ زیاتر دەڵێ: «خەلق بەوە ڕاهاتووە لە کتێبانەوە سەیری ئەو شتانە بکات کە لەبەر دەست و دەمیدان» . کۆمەڵایەتی و مێژووش زەڕڕە و ئاسمان نیین هەر بە کتێب تێیان بگەم، ئەوانەی نەزەریەی «زانستی» شیان لەو دیاردانە هەڵێنجاوە وەکوو من و تۆ سەریان بە مرۆڤی کۆن و نوێ داگرتووە، من و تۆش دوای ئەوان سەر بە مرۆڤەکە و نەزەریەکەی ئەوانیش دادەگرین قۆنتەراتیشیمان نەگرتووە لەسەر ڕاست دەرچوونی نەزەریەکان، کەس دوژمن نییە بە ڕاست بوونی نەزەریەکان، بەڵام نە مەرجە ڕاست بن نە ڕەوایشە چاوی خۆمان بەدرۆ بخەینەوە لە ئاست هەڵەی ئەواندا، ئینسافیش قبووڵ ناکات مێژوو کەوڵ بکەین هەر بۆ ئەوەی کەوڵی نەزەریەکانی تێوەرپێچین.

من کە بەچاوی خۆم چۆنایەتی مامەڵەتی خەلق، بە هەژار و دەوڵەمەندیەوە لەگەڵ یەکدیدا ببینم ناچمەوە بۆ نەزەریە بزانم چ فەتوایەکم بۆ دەدا لە بارەی ئەو مامەڵەتەوە چونکە ئەگەر هەر ئەوە بڵێ کە من دیتوومە دەبێتەوە «تحصیل حاصل» بە تەماش نیم درۆی لێ بسەلمێنم. من دەگەڕێمەوە بۆ نەزەریە لەو شتانەدا کە خۆم دەیانزانم نەک بە نیازی فەتوا لێوەرگرتن بەڵکوو بۆ حاڵیبوون لە ڕاستی و هەڵەیی نەزەریەکە خۆی. من

واقیع دەگرم بە شایەد لە نەزەریە نەک نەزەریە دەگرم بە شایەد لە واقیع. ئەو کۆمەڵگەیەی دەیناسم و لەگەڵیدا دەژیم و هەست بە نەبزی دەکەم پتر مەفهومە بەلامەوە لە نەزەریەی ناو کتێبان. هانا بردنم بۆ نووسینی ناو کتێبان لەو شتانەدا دەبێ کە تێیان ناگەم وەیا نایانزانم و لای من مەوجوود نین خۆ ئەگەر لە سەهوێکیشی گێڕامەوە زۆری مەمنوون دەبم بەڵام هەمیشە مەمنوونی ئەو واقیعەش دەبم کە سەهووی ناو کتێبانم پێ دەڵێ.

وەها بووە لە دەعوای «تەسویە» کە موڵکایەتیی زەوی ساغ دەکاتەوە لە دێیەکدا کە عمری خانوەکانی لە شەست ساڵ پتر بووە، بارستی گوفکەکانی لە بەرزایی خانووەکانی هەڵکشاوتر بووە، درختی چەمەکانی چەندین جار چەم بڕ کراوە، دیمەنی جۆگە و شەلەگە و مەزراکانی دەیان ساڵی ڕانواندووە، ئا لەو دێیەدا بابای «دادپرس» داوای «مستەمسکات» ی لە خاوەن زەوی کردووە بۆ ئیسپاتی «تصرفی» لەو زەویانەدا. بەو پێیە دوو کیلۆمەتری چوارگۆشەیی لە کێڵگە و کۆنە خانوو گوفک و جۆگە و چەم و بەراو و شیناورد و گەنم و جۆ بەلای ئەو دادپرسەوە نرخی یەک پارچە کاغەزی نووسراوی نەبووە کە دەشێ بە 10 دینار بەرتیل ساز بدرێ. بەلای منەوە «مستمسکات» هێزە بۆ واقیع نەک خالقی واقیع، کە موستەمسەکاتیش نەبوو پەکی لەسەر ناکەوێ چونکە واقیعەکە هەیە، بایەخی موستەمسەکیش لەوەدا دەبێ کە لەگەڵ واقیع بگونجێ.

نەزەریە بریتییە لەو موستەمسەکەی دادپرس داوای دەکات لە ئاست چۆنایەتی و چەندایەتی زەوی بە بەراو و پشتاو و پاوانیەوە. جا ئەگەر موستەمسەکەکە بە سەهوو چووبوو لە زۆری و کەمی ئەو چۆنایەتیە و چەندایەتیەدا نابێ خەریکی گونجاندنی زەویەکە ببین لەگەڵ ئەو هەڵەیە، بە پێچەوانە دەبێ هەڵەکە ڕاست بکەینەوە بە پێی داخوازی واقیعی دێیەکە. خۆ ئەگەر هەڵەکە ڕاست کردنەوەی هەڵنەگرت دەبێ موستەمسەکەکە بسووتێنین.

نەزەریە و موستەمسەک جۆرێکن لە «ژوورخان- ڕووبەنا» شەرەف لەوەدا وەردەگرن کە بە دروستی وێنەی «ژێرخان- ژێربەنا» بدەنەوە دەنا دەبنە بوختانکەر و شایەدی درۆزن.

ئاکامی ئەو نەزەریانەی چل ساڵە گەنجی کورد بەخۆیانەوە خەریک دەکەن شتێک نییە پێویست بە کوتانەوە بکات، چارەڕەشیش بەوەدا شیرین نابێ کە لە ژوورخانی نەزریانەوە بباریێت.

جارێکی دیکەش با بگەڕێمەوە بۆ نامەکەی مامۆستا ئەمیر.

لەو چەند دێرە ئامۆژناکەیدا کە داوامان لێدەکا «ژێربەنا و ڕووبەنا — ژێرخان و ژوورخان» تێکەڵ بەیەکدی نەکەین ڕوومان بەرەو دەستوورێک دەکا کە دەمانگەیێنێتە ئاکامی ئەوتۆ کە مامۆستا ئەمیر نایەوێ لە خەون و خەیاڵیشدا بیانسەلمێنێ: کە پێت بڵێم «ماهیە» و «عرض» ی مرۆڤەکە خۆی تێکەڵ مەکە یەکسەر دەرەبەگ و جووتیار و پارەدار و کرێکار و داگیرکەر و داگیرکراو و عەبد و خاوەنەکەی هەموویان دەچنە ژێر یەک سەرەناوەوە چونکە «ماهیە»ی هەموویان مرۆڤایەتیە هەرچی پارە و موڵکداری و داگیر کردن و ئازادی و عەبدایەتی و ئەو جۆرە خەسڵەتانە هەیە هەموویان «عرض» ن و لە لاوە هاتوونەتە سەر مرۆڤەکەوە. بە تەواوی وەک کە مامۆستا ئەمیر دەیەوێ لێی بسەلمێنین«ماهیە»ی دەرەبەگایەتی کورد و فارس و ئینگلیز یەک چشتە و بەوە لەیەکدی ناترازێن کە «عرض»ی وەک ئایین و ئەدەب و هەژاری و سامانداری و داد و ستەم و پێشکەوتن و پاشکەوتن و دەسەڵات و ژێردەستی لە کوردەوە بۆ ئەڵمان دەگۆڕێن.

بەپێی ئامۆژگاریەکەی کاک ئەمیر تۆ دەبێ چاو ببڕیتە ئەو ڕاستیە بنجیە گرنگەی کە کوێخا ڕەسووی وەسوێنەی پشدەر لە چەند پارچە زەویەکیدا چوار ڕەنجبەر دەچەوسێنێتەوە ئیتر بە خۆیی و جەمەدانە شرەکە و خانووە وێرانەکە و بزنە گەڕەکە و دار سێوە گرمژنەکە و حەوشە گوفەکەکەیەوە لە ژێر سەرەناوی «فیودالٚ» دا دەبێتە هاوشانی خانەدانی «برنادۆت» ی سوید بە خۆیی و پۆپی ژیار و زانست و هونەری سەدەی بیست و یەکەمیەوە نەک بیستەم..

«زۆراب» ی جووتیاری دەشتی «هەریر» یش کە لەوەتەی سۆمەر و ئاکادەوە بەدوا کلکی گاڕەشدا گیانی خۆی تێکەڵ بە خەتە جووتی ناچارییەوە دەکات و ئێواران وەک دەستی کەر لە کونە بۆقرێکی کێچاوی دوکەڵاوی بێ ڕایەخ و بێ خۆراک سەلار دەبێتەوە لەگەڵ کامووسی مێردەزمە تێک دەئاڵێن، ئا ئەم زۆرابە هاوڕێ و هاوچین و هاوچارەنووسی «هانز» ی لێخوڕی تراکتۆری دەورەی «مۆنیخ» ـە کە دوای بەسەرچوونی فەرمانی ڕۆژانەی بە سوورای ئۆتۆمۆبیلی خۆی دەچێتە هۆڵی مەستی و دڵداری و گۆرانی و دانس چونکە «ماهیە»ی هەردوویان «ڕەنجبەری و کرێ گرتەیی» یە لەوە بەو لاوە کونە بۆقرِ و تەلار و هەژاری و تێری و پرزۆڵی و پۆشتەیی و سەرانگوێلک و هۆڵی دانس هەموویان «عرض»ن بایی سەری دەرزی ئەم دوو «هاوڕێیە، هاوچارەنووسە، هاودژومنە، هاو نازانم چییە» لە یەکدی جودا ناکاتەوە. تەنانەت ئەو ڕاستیەی کە «هانز» بێزیشی نایەت لەگەڵ ئاغاکەی زۆرابدا تۆقە بکات نەکا دەستکێشەکەی بگۆنێ، ئەویش ڕاستیەکی «عرض»یە کار ناکاتە سەر جوداوازی چیانیەتی نێوانیانەوە، لەوەدا کە «هانز» چەوسێنراوە و خوێنمژراوە ئاغاکەی زۆرابیش خوێنمژ و چەوسێنەرەوەیە هەرچەند لەوانەیە کچی خۆیشی لە زۆرابی خوێنمژراو مارە بکات.

ئەم یەکچوون کردنەی شتی لە یەکدی جودا لە ڕێی بەکارهێنانی تەعریف و سنووردانانەوە بۆ تێبردنی جوداوازییە لە سنووربەدەرەکانی نێوانیان، لەو ساڵانەدا زۆر بە چاپلووسی لە دەستووری یەکێک لە دەوڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا بەکار هاتبوو کە لە ماددەیەکیدا نووسرابوو «العمل شرف والحکم تکلیف و لیس تشریفا» ڕاستیەکەی منیش بەدەست خۆم نەبوو یەکسەر بە لەهجەی نێو بازاڕی میللەتی ئەو دەوڵەتە گوتم «هات تکلیف بلاش تشریف» — تکلیفم بۆ بهێنە تەشریی پێ ناوێ...

ڕایەکەی مامۆستا ئەمیر کە دەنگدانەوەی بیروڕای مەدرەسەیەکی پان و بەرین و قوڵ و دوور و درێژی ئەم سەردەمەیە لە لایەکەوە بە ناوی دۆزینەوەی بنەمای ماددیی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان پەنجە لە «ماهیەت و ژێرخان» گیر دەکات هەر بۆ تاکە مەبەستی گرێدانی ژوورخان لە ژێرخان (گرێدانی عرض لە ماهیە) تاکوو کۆمەڵایەتی و مێژوو زادەی ماددەبن نەک لە سەرچاوەیەکی نامادیی هەڵقوڵێبن، لە لایەکی دیکەشەوە هەموو جوداوازیەکانی نێوان ئەو «عرض و ژوورخانانە» لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێک، کە تا ڕادەی بەرەواژبوون پشت لە یەکترن، بێ بایەخ دەکات کە یەکسەر دەبێتە تێبردنی «پێوەندی سەبەبی» لە نێوان «هۆ و ئاکام- سبب و نتیجە» کەچی دەبوو دۆزینەوەی «بنەما، ماهیە، ژێرخان- ژێربەنا» ڕاستەوخۆ بمانباتەوە بۆ ئەو «عرض، ژوورخان» انەی کە بە پێی ڕاگەیاندنی فەلسەفەکە لەو ژێرخانەوە سەریان هەڵداوە و دەبێ بە ناچاری خزمی ئەو بن دەنا ئەگەر ژوورخان بەند نەبێ بە ژێرخانەوە، «عرض»بەند نەبێ بە «ماهیە» وە، کەس پەکی لەسەر ناسینەوەی ئەو «ماهیە» ە فیوداڵە نەکەوتووە کە لە «سەردەشت» هێلکە بکات و لە «تاران» یش خەنە بفرۆشێ.

بنەما و ماهیەتی فیۆدالیسم بە یەک ڕستەی دە پیتی لێی دەبینەوە، وەک کە مامۆستا ئەمیر لێی بۆوە، بێ مامۆستاش دەیناسینەوە لەوەتەی ئادەمیزادیش

هەیە ناسیویەتی. دەمێنێتەوە ئەو «ڕووبەنا، ژوورخان، عرض» ـەی لەسەر زەقایی و ڕەقایی فیۆدالیسمەوە هەڵداوە، ئەویان بریتیە لە هەموو وجودی مرۆڤ بە خۆی و مێژوو و کۆمەڵایەتی و بڕوا و کفر و داد و ستەم و خوێندوویی و نەخوێندوویی شەڕ و ئاشتی و برسیەتی و تێری و ئەدەب و زانست و هونەر و کێشانەی شەرەف و نامووس... و... هەموو هەموو شتێکیەوە هەر لەو دەمەڕا کە لە مندالْدانی دایکیەوە بەردەبێتەوە سەر خاک تا ئەو کاتەی دەچێتەوە مندالْدانی خاکی سامناک ئنجا کە هەموو وجودی کوردی «فیۆدالْ» لەگەڵ هەموو وجودی ئینگلیزی «فیۆدالْ» هێندەی ڕەش و سپی پشت لە یەکتربوون و هیچ ئاکارێکی کۆمەڵایەتیان و هیچ ڕێکارێکی ژیانیان و هیچ خودخودەیەکی خەون و خەیاڵیشیان، کەم و زۆر ئاشنای یەکدی نەبوون چ کارێکمان بە قەپێلکی بەتاڵ و حەتاڵی «فیۆدالْ» دەمێنێ کە هێندەی کەڵەشێری ئێواران لە بەڵێنی ڕۆژ و تاو درۆزن بێ.

زاراوەی ئەوتۆی ئەگەر خەڵق بۆی نەبێ بەو دەروێشەی جندۆکەی نەدیتراوی شێخەکەی دەسلمێنێ کاریگەرایەتی پێوە نامێنێ.

گوێ نەدان بە جوداوازی لە حەد بەدری نێوان ژوورخانی دوو وڵاتی ڕواڵەت فیودالْ یەکسەر و سەر لەبەر دەمانکات بەو نوێژکەرەی کە لە حسابی خۆیدا «ماهیە»ی نوێژ و دەسنوێژ بەوە ناگۆڕێ ئایا لە بیابانێکدا «تیمم» دەکات وەیا لە قەراغ کانیەک و ژێر سێبەری درەختی میوەدار و بێنخۆشدا بە ئاوی ڕوون دەستنوێژ دەشوات: هەمووی هەر نوێژ و و دەستنوێژ و ڕوو لەخوا کردن و بەرەو بەهەشت بوونەوەیە. سەیریش لەوەدایە دەبوو تیۆری ماددی پتر لەوە باوەڕی نوێژکەر پێداگرێت لەسەر ئاو و درەخت و میوە چونکە لە باوەڕی ئەودا، کە ماددییە، ئەمانە بەهەشتەکەن... ئنجا ماوە بڵێم بابای نوێژکەر جارێکی دیکەش لە جغزی باوەڕی خۆیدا بابای ماددی جێدەهێڵێتەوە بەوەدا کە ئاوی چنگ کەوت تیمم بەتالْ دەبێ، کەچی فیودالیسمی کورد کە وەک بەردی ڕەق تۆزی لێهەڵناستێت تەیموومی پێ

بکرێت، لە تەک هیچ فیودالیسمێکی پێشکەوتووی ئەم جیهانەدا بەتاڵ نابێتەوە. ڕوتبەیە بەسەر شانی کورددا دووراوە.

ئەی مامۆستا ئەمیر!
ئەی خوێنەری کوردا!
ئەی تێکڕای ڕۆشنبیران!

کە قسە لە «ماهیە و عرض» بکەین و بایەخ بەو جودا کردنەوەیە بدەین دەبێ، هەر بەپێی ئەو لێکدانەوەیەی مامۆستا ئەمیر بۆی چووە، لە سەرەتای هەموو بایەخپێدانێکدا بڵێین کە دوو «ماهیە» هاوچوون بوون «عرض»ی هاوچوون بەرهەم دەهێنن. هەر لەم بەدیهیە سەرەتاییەوە دەبێ بڵێین جودابوونی «عرض» جودابوونی «ماهیە» بە ئیسپات دەگەیەنێ. لێکدانەوەی ماددی کە دێت و ژوورخان لە قۆناخی مێژوویی هۆی بەرهەمهێنان گرێ دەدات ناتوانێ، نە بە ئاسانی و نە بەزەحمەت، خۆی بدزێتەوە لە یەکدی نەچوونی ئەو ژوورخانانەی کە گۆیە لەسەر بنەمای گارەش و گاسن و زەوی و باران و دانەوێڵە و چەوسانەوەی جووتیار هەڵدەدەن هەروەک لە کەس ناسەلمێ بڵێ گەنمم چاند و ماشی لێ ڕوا وەیا فلانم فێری ئاشەوانی کرد و بوو بە مەلا.

لەو باوەڕە ماددیەی کە مامۆستا ئەمیر کردویە بە ڕوانگەی مێژوو کۆمەڵایەتی هیچ یەکێک لە سەرچاوە و دەستوورەکانی ناتوانێ ئاکامی لەیەکدی جودا بگێڕێتەوە بۆ بنەمای هاوچوون، نەتوانینەکەشی یەکسەر لە بەستنەوەی کۆمەڵایەتی مرۆڤایەتی بە بنەمای ماددی مردوو ڕەق و تەقەوە هەڵدەدات، بە نموونە دەڵێم، لەو باوەڕەدام کە دەوری گۆڕانی هۆی بەرهەم دەکرێتە ماکی گۆڕانی مێژوویی و کۆمەڵایەتی لە پێشەوە دەوری سەربەخۆ و کاریگەری مرۆڤەکەی کە دروستکەری هۆیەکەیە، پەککەوتە دەکرێت و ڕیشی دەدرێتە دەست گاسن و تۆڕ و ئێستر و نازانم چی، هەر دەڵێی

ڕاوکەرەکە عەبدی ڕێویەکەیە قەسابەکەش بەردەستی مەڕ و بزنەکە. هیچ شی کردنەوەیکی فەلسەفی وەیا «زانستی!» ناتوانێ تەفسیری مێژووی کۆمەڵایەتی بکات ئەگەر دەوری یەکەم و هەرە گرنگ لەواندا نەداتەوە بە مرۆڤەکە خۆی کە هەر خۆی خاوەن و خالقی هەردووویانە: دەبێ مێژوو لە گاڕەش و داسن و خەڕەک بستێنینەوەو بە گاڕەش و گازەردیەوە بیدەین بە مرۆڤ ئنجا تێی دەگەین.

لە بیروباوەڕی مندا کە تا ڕادەیەک لە دەرنەچوونی تەحلیلی ماددیەوە زەنەی کردوە، ئەم جیهانەی تێدا دەژین و بەسەر دەچین و وردە وردە پتری لێ حاڵی دەبین، سەرلەبەری دابەش دەبێ بە سێ کەرتی گردەبڕی لەیەکدی جودا:

1- جیهانی ماددەی مردوو (سروشت) بە خۆی و دەستووره ئەزەلی و ئەبەدییە نەگۆڕاوەکانی و کە لەوێدا زانینی «ڕووداو» بەند دەبێ بە زانینی ئەو عامیلانەی تێیدا بەشدار دەبن، چونکە هیچ یەکێک لەو عامیلانە نە دەزانێت توورە بێت و نە دەزانێت بیەوێت و نەیەوێت و نە لە دەستی دێت خۆگیری وەیا پەلە بکات. هەموویان «امر واقع» ن و بە شێوەیەکی ئالەتی بێ گۆڕان و بێ هەڵە و بێ هەست و بێ زانین و بێ خوایشت کار دەکەن یا ناکەن. تەحلیلی ماددی تەنها بۆ ئەم جیهانە ماددیە بێ گیان و بێ خوایشتە دەست دەدات کە هیچ کەلەبەری تێدا ناهێڵێتەوە و ئاکامی پێشەکیەکانی لە سەرەتاوە ڕوونە. لەو جیهانەدا «عرض» بەندە بە «ماهیە» وەک ئەوەی کە ماهیەتی «H2O» هەمیشە یەک جۆر «عرض» بەدەستەوە دەدات چ لە کوردستان و چ لە ژاپۆنستان و چ لە فەرەنگستان بێت. هەر کەسێک و هەر نەزەریەک بیەوێت پەراوێزی شی کردنەوەی ماددی پان بکاتەوە تا باوەش بە غەیری ماددەی مردوودا بگرێ

شەڕ بە واقیع دەفرۆشێ، دەیەوێ بە زۆرەملێ زیندوو و مردوو، هۆشدار و بێهۆش یەکسان بکات.

2- جیهانی گیانەوەر (حیوان، دواتر بە کزی ڕوەک) کە لە وێدا بایی نوێ بوونی کاریگەری «گیان – زیندوەتی» لەچاو کاریگەری ماددەی مردوو تفاوت لە «عرض». کانیەک ماهیەتی زیندوەتی پەیدا دەبێت بەڵام تەفاوتێکی ئەوتۆیە لە پلە سەرەتاکانی «گیانلەبەری» دا ڕەنگە بە ئاستەم هەستی پێ بکرێ لزومیش نابینم لێرەدا جوداوازی نێوان ڕوەک و زیندەوەر باس بکەم چونکە پەکی لەسەر نەکەوتووە.

3- جیهانی «هۆشلەبەر» کە بریتیە لە «مرۆڤ»
کاریگەری «مرۆڤایەتی» بە تەواوی لە هەموو ڕوویەکەوە جودایە لە جیهانی ماددە و گیانەوەر، چونکە ئەو خاسیەتانەی مرۆڤیان پێ دەناسرێتەوە کەم و زۆر نە بە ونی و نە بە ئاشکرایی لە هیچ بوونەوەرێکدا وجودی نییە. کۆمەڵایەتی و مێژوو بە هەموو سەروبەرێکیانەوە تایبەتی مرۆڤن کە دەچێتەوە بۆ پێداویستی «هۆش و زات» . لەو دەمەوە کە کاریگەری هۆش و زات هاتە کایەوە هەر چونکە ئالیەتی گیانلەبەرایەتی و حەتمیەتی بوونەوەری ماددەی مردوو لە هۆش و زاتدا نییە جوداوازی «عرض»ـەکانی مرۆڤایەتی دەستی کرد بە نما کردن تا ئەو ڕادەیەی کە شیا سەرلەبەری ژوورخانی ئوسترالیای کۆن لە هی میسری کۆن هێندە جودا بێ یەکدی نەگرنەوە. ئەو کەسانەی دێن قۆناغی مێژوویی دەدەنەوە بە «هۆی بەرهەمهێنان» و لە مرۆڤی دەستێننەوە، لە ڕاستیدا، ماددەی مردوو دەبەنە جێگەی مرۆڤ و مرۆڤەکەش دەچێتە جێگەی ئەو ماسییەی بە تۆڕ و قولاب ڕاو دەکرێت، چونکە مرۆڤەکەش لەو تەرزە شی کردنەوەیەدا مەحکومی تۆڕ و

قولابەکەیە، ئنجا مەحکومی ماسیەکەشە بە نامەی ناچاربوونی بۆ ڕاو کردنی ماسی بە نیازی خۆ ژیاندن..

پێشخستنی دەوری مرۆڤایەتی لە شی کردنەوەی مرۆڤایەتیدا شی کردنەوەی کۆمەڵایەتی و مێژوویدا جگە لەوەی کە تاکە ڕێگەی بەرەو ڕاستیە لە تەجروبەشدا دەردەکەوێت کە ئیمکان نییە بێ ئەو پێشخستنە تەعلیلی ڕووداوەکانی مێژوو و کۆمەڵایەتی لە هیچ کوێرە ڕێگەیەکەوە بکرێت، قوت کردنەوەی ژێرخانی ماددەی مردوو بۆ تەعلیلی ژوورخانی هەزار چەشنەی کۆمەڵایەتی و تاکایەتی لە یەکەم هەنگاودا پەکی دەکەوێ کە بێین و بەراورد لە نێوان دوو برای داک و بابیدا بکەین: هەردووکیان لە تاکە یەک ژێرخاندا دەژین بە خۆراک و پۆشاک و ڕۆژانە و خوێندن و نەریت و ئایینەوە کەچی لەبەر هۆیکی لاوەکی کەوا ڕەنگە لەچاو ئەو ژێرخانە یەکچەشنەدا بێ بایەخ وەیا کەم بایەخیش بێ برایەکیان «-» بێت و ئەوی دیکەیان «+» بێ. تۆ بێنە دوو کەڵەشێر لە جێگەی ئەو برایانە دابنێ، بێگومان ئەگەر لە یەک تۆو کەوتبێتنەوە زۆر لە یەکدی دەچن. بە هەمە حاڵ ئەگەر بۆ تاقی کردنەوەی هاوچوونیان کەڵەشێرەکان لە نێوان دوو براکە و دوو پەرداخ ئاودا دابنێیت بەلای پەرداخەکاندا دەچنەوە چونکە ماکی «هۆش و زات» کە بنەمای تەفاوتی «عرض»ـە، نە لە کەڵەشێر و نە لە ئاودا نییە.

فیۆدالیسمەکەی کە مامۆستا ئەمیر دای دەنێ بە «ماهیە» ئەویش بۆ خۆی تەفسیری لە یەک نەچوونی «عرض»ـەکانی لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێک ناکات هەتا مرۆڤەکەی تێدای نەکەیتە یەکەم کاریگەر و ڕابەر. ئاو و خاک لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێک بنەمای هاوچەشنن بەڵام ئەو کۆمەڵایەتیەی کە جۆری مڵکایەتیی ئاو و خاک و گا و گاسن قەرارداده دەکات خۆی دەبێتە «ماهیە»ی ئەو «عرض»انەی لە ڕواڵەتی فیۆدالیزمەوە زەنە دەکەن. لێرەدا ئاشکرایە کە عەیامێک لە وانەی کۆمەڵایەتیەکە پێک دەهێنن «مڵکایەتی» ی ئاو و خاکە، کە بەشێکی دەچێتەوە بۆ ئاو و خاکەکە خۆی، بەڵام هەمیشە

له ئاکامی تەفاعولیان لەگەڵ «مرۆڤایەتی، کۆمەڵایەتی» دا دەور دەبینن وەک هەموو ئەو کاریگەرە ماددی و ناماددیە بێ ئەژمارانەی دیکەدا کە تێکرایان لەگەڵ «کۆمەڵایەتی» دا تەفاعول دەکەن و دەبنە «ماهیە».

بارتەقای کورتهێنانی نەزەریەی ماددی لە شی کردنەوە و تەعلیلی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان، نەزەریەی «شی کردنەوەی بەشەری» کە من لێرەدا لەسەری دەکەمەوە تەفسیری ڕاستینەی ئەو دیاردانە دەکاتە کاری بەدیهیە بێ ئەوەی ناچار بێ «عرض» لە «ماهیە» بدزێتەوە وەیا بۆرە تەئویل بهێنێتەوە بۆ لەیەک نەچوونی ئەو «عرض»انەی کە بە پێی فکری ماددی لە بنەمای «ماددی» یەکچوونەوە هەڵدەستن. هەر وەک لە ڕێی «تەفسیری بەشەری» ـیەوە دەتوانین تێ بگەین بۆچی دوو برا و دوو خوشک کە لە یەک شوێن و دەوروبەر و «بنەمای ماددی» دا دەژین تا ڕادەی بەرەواژ بوون لەیەکدی جودابن، هەروەهاش دەتوانین تێ بگەین بۆچی دوو میللەتی یەک قۆناخی مێژوویی تا ڕادەی بەرەواژ بوون لە یەکدی جودابن.

ئێمە کە مرۆڤ و کۆمەڵایەتیمان کرد بە بنەمای قۆناخی مێژوویی و دیاردەی فیۆدالیزم و کاپیتالیزممان خستەوە جێگەی ڕەوای خۆیان لە نێوان دەیان و سەدان کاریگەری پێک هێنەری سەر لەبەری کۆمەڵایەتیەکەدا هیچ سەیرمان نایەتەوە لەوەی ژوورخانی ژاپۆنی سەرمایەدار جودابێ لە ژوورخانی ئەڵمانیای سەرمایەدار چونکە «کۆمەڵایەتی» هەر یەکێک لەو دوو وڵاتە بڕیاری مێژوو بەپێی ئەو ڕاستیە ماددی و ناماددیەی لە دێرینەوە خەریکن قەوارە بۆ میللەتەکانیان دادەڕێژن «ماهیە»ی جودایان لێ پێک دەهێنن کە ماهیەتیش جودا بوو ژوورخان بە ناچاری جودا دەبێ.

بێگومان ئەگەر ڕێکەوت وەها بوو کە دوو میللەت ماک و بنەماکانی کۆمەڵایەتیان لەیەکدی نزیک بوون ژوورخانیشیان لەیەکدی نزیک دەبێ تەنانەت هیچ سەیر لەوەدا نابێ کە دوو میللەتی خاوەن دوو ڕژێمی ئابووری

لەیەکدی جودا وەک فیۆداڵ و بۆرژوا بەهۆی هاوچوون بوونی مەعنەوییاتیان و لەیەکچوونی شێوازی گوزەرانیان و داب و دەستوور و نەریتیان و گەلێک باری ماددی و ناماددی دیکەی ژیانیانەوە سەر لەبەری «ژوورخان» یان خزمی یەکدی بێت چونکە ئابووری نە خۆی لە خۆیدا دوور لە خوایشت و قەناعەتی مرۆڤ نەخشەی کۆمەڵایەتی ڕەنگڕێژ دەکات نە مرۆڤیش قوڕە چەورەیە بەدەست ئابووری و دەوروبەر خێرا بە خێرا پێستی دوێنێی داڕنی و گورج هی نوێ لەبەر بکات.

گۆڕانی ڕژێمی ئابووری یا لە «نوختەی تەنگەتاوی- critical point» دا بە شۆڕش دەبێ وەیا بە جۆرێکی لە سەرەخۆ و بێ هەڵپە و کڵپە دەبێ. ئەوەی لە شۆڕشدا دەرحاڵ دەگۆڕێ دەسەڵاتی سیاسیە، هەرچی خڵتەی کۆمەڵایەتی ڕۆژگارانی بەر لە شۆڕش هەیە، بە جۆرێکی بەهێزتر لەوەی پێی بڵێن «میراتی»، بۆ کۆمەڵگەی دوای شۆڕش سەرەوژێر دەبێتەوە. خۆ ئەوەی پێی دەگوترێ «عقیدە» بە کوتەک نەبێ تێ ناچێ، وەها دەبێ کوتەکیش چاری عەقیدە ناکات مەگەر لە ماوەیەکی دوور و درێژی ئەوتۆدا کە بە بەریەوە هەبێ هەموو شتێک بگۆڕێ و لەناو بچێ.

سەرنج ڕاگرە دەبینیت هیچ ژوورخانێکی سەر بە ئابووری و ڕامیاری و ماددە، بە تێکڕایی، دەیەکی عومری ئەو ژوورخانە غەیبیەی نابێ کە بەلای فکری ماددیەوە لە بۆشایی ڕاوەستاوە. هەر چونکە عەقیدە بەرهەمێکی دەروونی مرۆڤە دەروونیش باری سیاسی و ئابووری نییە ڕاستەوخۆ بەند بێ بە دەروەی وجودی مرۆڤ. ڕاستیەکەی باوەڕی سیاسیش ئەگەر شێوەی «غیبی» و ئایین وەرنەگرێ مرۆڤ خۆی بەقوربان ناکات.

لەو بارەدا کە گۆڕانی ڕژێم بێ شۆڕش ڕوو بدات، گۆڕانی کۆمەڵگەی کۆن هەر بە قەدەر تەفاوتی هەست پێ نەکراوی لەسەرەخۆی ساوایی و منداڵی و جحیڵی هەستی پێ دەکرێ، ئیتر دەشێ دیاردەی کۆمەڵایەتی ساڵانی 1700

و 1900 بەیەکەوە بژین، ئەوەی ڕاستیش بێ «ئایین» ی بەر لە 2000 ساڵ لەگەڵ ئیلحادی سەردەم بەیەکەوە لە وڵاتێکدا هەڵدەکەن ئەگەر دەسەڵاتی سیاسی خەفایان نەکات، ئەمەش دیاردەیەکە لە هەموو ئەو وڵاتانەی ئازادیی بیروباوەڕیان تێدا پارێزراوە بەرچاو و بەرهەستە.

بیر کردنەوەی ماموستا ئەمیر لەو سەرچاوە فەلسەفییەوە هەڵدەستێ کە لە شی کردنەوەی گۆڕانی مێژوویی و ڕووخساری کۆمەڵایەتیدا تەنها چاو دەبڕێتە دەستەی دەسەڵاتداری سیاسی: ئایا زەویدارە یا پارەدارە فیۆدالە یاخود بۆرژوا بێ ئەوەی گوێ بداتە پاشخانی هەزاران ساڵەی میراتی بەلایەنی ماددی و مەعنەوییەوە لە میللەتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە کەچی بەزۆری ئەو پاشخانە دوور و درێژە کە دەفری وجودی مرۆڤە خۆی لە فیۆدالیزم و کەپیتالیزم دەدات و قاڵبیان بۆ ساز دەدات بەو جۆرەی کە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر نەیناسیتەوە: بە نموونە لەوانەیە دەسەڵاتی کاپیتالیزم لە وڵاتێکدا کە بەحوکمی عەسکەری ڕاهاتووە لە ئاکامدا بکێشێتەوە بۆ فاشیزم کەچی لە سویددا بەرەو سۆشیالیزم بڕوات. لەوانەیە زەوی و پارە لە وڵاتێکدا هودنە لەگەڵ یەکدیدا ببەستن بێ ئەوەی دەستدرێژی لە ئازادیی دادگا بکەن، لەوانەیشە لە وڵاتێکی دواکەوتوودا، کە خەریکە بێنی ڕاپەڕینی سەردەمی کۆن و نوێی تێدا بەخەبەر و بەشەڕ دێنێت، یەکگرتنی زەوی و پارە بەر لە هەموو شتێک بەگژ ئازادیی دادگا بێتەوە.

دوور مەبینە پاشخانی هەزاران ساڵەی تێکڕای مرۆڤ دەوڵەتێکی شیووعی ناچار بکات بەوەی مڵکداریی لە فەلاح بسەلمێنێ وەیا جغزی مڵکایەتیی تاک فرەوانتر بکات لەوەی فەلسەفەکەی دەیسەلمێنێ. هەر ئەمەیشە بەچاوی خۆمان دەیبینین لە هەڵسوکەوتی تەجرەبەی کۆمیونیزم کە لە تیژڕۆیی هەوەڵ تەکانەکانی خۆی کەم دەکاتەوە بەرەو پووچاندنەوەی ڕاگەیاندن و بڕیارە یەکجارەکیەکانی لە بارەی بەسەرچوونی زەمانی «مڵکایەتی» بە تێکڕایی.

ئێمە گەیشتینە ڕۆژێک دیتمان حیزبی شیووعی بەهێزی وەک هی فرەنسە بڕیاری دا لەسەر پێویست نەبوونی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا. ڕۆژانی دیکەش زۆرن لە پێشمان کەوا گەلێک بڕیاری لێوە بەهێزتر و بە جورئەتتر لە جیهانی شیووعی و ناشیووعی دەنگ بداتەوە. تۆ سەرنج بگرە لەوەدا کە چونکە بە ئەسل جودا کردنەوە و لە یەکدی دابڕینی یەکجارەکی گردەبڕ لە نێوان چینەکان و قۆناغەکانی مێژوودا پتر کاری خەیاڵ بوون نەک واقیع، نەزەریەی ماددی مێژوویی هەتا دێت تووشی ئاکامی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەوتۆ دێت کە ببڕای ببڕای لە پێشەکیەکانیدا جێگەیان بۆ نەکراوەتەوە، تومەز «ماهیە»ی مێژوو، کۆمەڵایەتی و ئادەمیزاد بەگشتی گەلێک پان و قووڵترە لە تەنکاوی قۆناغ و هۆی بەرهەمهێنان کە هەردوویان بەندن بە چەندوچۆنی مرۆڤەکە و هێندێکن لە دنیای بەربەرەڵڵای مرۆڤایەتی. بە نموونە لە کتێبەکەی «لینین» لە ژێر سەرناوی «دەوڵەت و شۆڕش»دا دەخوێنیتەوە گۆیا لەگەڵ پەیدابوونی چەوساندنەوە چینی سەرووی کۆمەڵ بۆ تاکە مەبەستی بەردەوام کردنی چەوساندنەوەی چینی خواروو حکوومەتی دانا و داموودەزگای پۆلیس و بەندیخانەی ڕێک خست ڕۆژێکیش کە لە ڕژێمی کۆمینیزمدا چەوساندنەوە بەسەر دەچێت ڕێکخراوی حکوومەت لەخۆوە دەپوێتەوە، چونکە هۆی بەردەوام بوونی نامێنێت. کەچی بە پێچەوانەی ڕاگەیاندنی ئەو بەڵێنە هەر چونکە ڕایەکە تاکە یەک کۆڵەگەی «چەوساندنەوە» ی داوەتە بەر ساباتی «دەوڵەت» دەبینین سۆڤێستان ڕۆژ لە ڕۆژ کۆڵەگەی نوێ بابەت دەداتە بەر ساباتی دەوڵەت تا بتوانێ بەسەر پێیانەوە بوەستێ. جا ئەگەر بگوترێ ترسی دوژمنی دەرەکی و هەڕەشەی ئیمپریالیزم جارێ ڕێ نادات قسەی لینین بێتەدی، لە دوو ڕووەوە ئەو پشتگیری لێ کردنە بەتاڵ دەبێتەوە:

ڕووی یەکەم ئەوەیە کەوا گەلێک لە دامودەزگەی حکوومەتی سۆڤیەت پێوەندیان بە هەڕەشەی دەرەکیەوە نییە و ڕاستەوخۆ بەنیازی لغاو کردنی

نارەزامەندی نێوان چینەکانی میللەت دێنە کایەوە [گوتم چینەکانی میللەت لێشی پەشیمان نیم].

ڕووی دووەم ئەوەیە کەوا لەو دەوڵەتە پێشکەوتووانەی وەک سوید و دانیمارک و سویسرەدا کە لە ڕێی بێ هەرا و بێ کڵپەوە بەرەو پێشبوونەتەوە دەسەڵاتی حکوومەت هەتا بڵێی کزە و هەر دەڵێی ڕایەکەی لینین ڕووی لەوان بووە نەک دەوڵەتی مارکسی کە خەریکە هەموو میللەت تێیدا دەبێتە حکوومەت.

ئەو نەزەریەی مامۆستا ئەمیر بیروڕای لێوە هەڵدەێنجێت جگە لەوەی کە فیۆدالیزم لەجیاتی «کۆمەڵایەتی – مرۆڤایەتی» دەکاتە «ماهیە» دێت دوو دیاردەی کۆمەڵایەتی سەر بە ئابووری و پلەی گۆڕانی مێژوویی تێکەڵ بە یەکدی دەکات، بەوەدا کە «مڵکدار» و «فیۆداڵ» بە یەک شت دادەنێت کەچی دوو شتی زۆر لە یەکدی جودان هەرچەندە لەناو توێژی فیۆدالیزمدا مڵکداری هەیە چونکە دیارە، بە عادەت، فیۆداڵی بێ زەوی پەیدا نابێ – کە دەشڵێم «بەعادەت» لەو ڕووەوەیە کەوا دەبێ مرۆڤی شەڕانی و جەربەزەی بێ زەوی زاڵ دەبێ بەسەر کۆمەڵ و فیۆداڵیشدا هەموو سوودەکانی فیۆداڵیزم بە بەر خۆی هەڵدەبڕێت و دەزگە و دەستەنداشی لەوە تێدەپەڕێ پێی بگوترێ جەردە. لە زۆر حاڵ و باری عەشیرەتگەریشدا براگەورەیی و ئەمر و نەهی بە یەکێکی لێهاتوو ڕەوا دەدیتری و دەکرێ بە سەرۆک کەچی هێندەی خەلقی دیکە زەوی و زاری نییە، بەڵام هەستە و پیتاکی براگەورەیی لە ئاواییەکە وەردەگرێ. ئەم تەرزە حاڵەتانەی لێ بترازێ دەبێ فیۆداڵ مڵکداربێ، بەڵام مڵکداری نافیۆداڵ کە دەکاتەوە «نادەرەبەگ» بە درێژایی ڕۆژگار لە کوردەواریدا بەرچاو بووە.

خاوەنایەتیی زەوی خۆی بە تەنها فیۆدالیزم نییە. لە گەلێک باردا چەوساندنەوەشی تێدا نییە، زۆرجارانیش بریتی بووە لە هەژاری ڕووت و

ڕەجاڵ. ئەو خاوەنایەتیەی لە کوردستان هەبووە بە دەگمەن نەبێ سەری نەناوە بە فیۆدالیزم چ لە ڕووی فرەوانی چغزی ملّکایەتیەوە بێ و چ لە ڕووی دەسەلاّتی سەلمێنراوی خاوەنەکەوە بێت، چ لە لایەن سەرچاوەبوونی ملّکایەتیەوە بێت بۆ یاسا و نەریت و ئەدەب و هونەر و ئەو جۆرە ئارایشتە نەرم و شلکەی ژین و ژیار.

تاک تاکێکی زەویداری کورد لە کوردستانی ئێران و تورکیادا ملّکایەتی و دەسەلاّتەکەی گەیشتۆتە ڕادەیەک پێی بگوترێ فیۆداڵ، ئەویش هەر لە ڕووی لایەنی ماددی مولّک و دەسەلاّتەوە، چونکە بارتەقای دواکەوتوویی کورد لە میللەتی دیکە فیۆداڵەکەشی دواکەوتوو بووە. نەبیستراوە و نەدیتراوە بنەماڵەیەکی فیۆداڵی کورد وەیا تێکڕای فیۆداڵەکان سەرچاوەی هونەر و ئەدەب و مۆسیقا و ڕەسم و دانس و ئەو جۆرە وردەکارییە ڕەنگین نەخشینانە بووبن. بارستێکی بە پۆزی «ڕووبەنا، عرض، ژوورخان» لە سەرچاوەی غەیری کوردەوە هەڵقوولیوە: ئایین کە دایکوباوکی زۆربەی هەرە زۆری ئەدەب و زانستی پتر لە هەزار ساڵەی دواینی هەموو ڕۆژهەلاّتی نزیک و ناوەڕاست بووە لە قورئانەوە بەسەر ئەو و کوردیشەوە داباریوە. یاسا و دەستووری دادگەی ڕەسمی لە داگیرکەرەوە بۆ کورد هاتووە. هونەری وەک ڕەسم و کۆلّین و پەیکەرتراشی و مۆسیقاسازی لە کوردەواریدا لە حوکمی نەبووندا بووە.

شیعری کوردی پێوەندی «نەسەبی» بە ڕابردووی کوردەوە نەبووە، یەکسەر لە عەرەبی و فارسییەوە بە درەنگەوە، بۆ ناو زمانی کوردی هاتووە. هونەرێکی خانەسازی «معماری» نەزاوە پێی بگوترێ ژوورخان. داب و دەستووری شەڕە خێوی و ڕاوەتانجی و ڕاوەبەراز کە گۆیا فیزونازی دەرەبەگ دەیداتەوە لە تەک سوارێنی و ڕاو و ڕەزمی دەرەبەگی ئەورووپادا شەرمە نەک سامانی کەلەپووری. ئیتر بلّێم چی: شێوەی پۆشاک و جۆری خۆراک کە هەر بەقەدەر پێستی لەش و جەرگ و دلّی ناو هەناو قەرزداری شتێکە پێی

بگوترێ «هونەر»، کەمتاکورتێکی فۆلکلۆرمان هەیە کەوا پێوەندی نە بە ئابووری و نە بە فیۆداڵ و نە بە پارە و نە بە هیچ سەرچاوەیەکی قەراردادەی دەسنیشانەوە نەبووە لە سەلیقەی هەستی زگماکی خاوەنەکەیەوە ڕوخسارێکی کۆمەڵایەتی کەمرەنگی بزرکاوی داوەتەوەوە بەپێی دەسەڵاتی تەعبیری شەخصەکە خۆیەوە کەوا ڕەنگە جارێکیان بەگژ زوڵمدا هاتبێتەوە و جارێکی دیکەش بێدەسەڵاتی شکاندبێتەوە، جاری سێیەمیش بە بەژن و باڵای چاوکاڵی گوێ بەگواریدا هەڵگوتبێ وەیا لە مەجلیسی خواپێداو و هەژاراندا بەپێی هەڵکەوت کۆڕی شین و شایی جۆشاندبێ. لە ڕووی بەگژدا چوونەوەی زوڵم ئەو بەشە فۆلکلۆرەی ڕووبەڕووی زوڵم بۆتەوە یەکجار کەمە لەچاو ئەو بەشەی خەریکی تەڕدەماغی بووە هەر نەبێ لەبەر دوو هۆی گرنگ:

1- ئەگەر بۆ بەلاوەنانی دەمەتەقە بسەلمێنین کەوا بابای شایەر و بەیتبێژ و گۆرانیچڕ دژی دەرەبەگ و دەسەڵاتدار بووە دەبێ بسەلمێنین بەشی زۆری داهاتی ئەو تاقمانەی لە شایی و دانیشتنی شەوانە و ڕاو و شەڕاخێوی دەرەبەگ و دەسەڵاتدارەوە دەچووە کیسەیانەوە، ئیتر چۆن دەبێ مرۆڤ چاوەنۆڕی پاداش بێ لە بری جنێوپێدان. ئنجا دەمێنێتەوە بڵێم کە بابای فەلاح و ڕەنجبەر و خوارووی کۆمەڵ بە تێکڕایی لەسەر مافی خوارووی خۆی لەگەڵ زۆردار بەشەڕ نەیێت چ ڕەوای هەقە داوا لە گۆرانیبێژ و زۆڕنائەنگێو و بەستەهۆن بکەین لەجیاتی ئەوان بە پاڵەوانپفی نانی خۆیان ببڕن!!

2- کۆمەڵ بە تێکڕایی لەو بارانەی گۆرانی، بەیت و بەستە و حەیران و لاوکی تێدا گوتراوە وەیا بەزم و شایی تێدا گێڕاوە مەبەستی تەڕدەماغی و خۆشگوزەرانی و کەیف و گەپ بووە نەک چاوسوور کردنەوە لە دەوڵەمەند وەیا لە هەژار، بۆیە بەزۆری گوێی شل کردووە بۆ قسەی نەرم و نیان و بندزێوکە. تا ئێستاکەش خەڵقەکە لەو بارانەدا هەروەهایە دەشبێ هەروەها بێ.

بەگژدا چوونەوەی زوڵم و شکاندنەوەی فیز و ناز و سەرشکێن کردنی لەحەد دەرچوون و باسی تەماع و زەرەر قازانج لەو بەشە فۆلکلۆرەدا دێت کە پێی دەڵێن پەندی پێشینان، چونکە لەوێدا تەڕدەماغی مەبەست نییە. لە پەندیشدا چەخماخە و تێکهاوێشتنی کۆمەڵایەتی هەر بایی ئەوەی لە واقیعدا هەبووە ڕەنگدەداتەوە کە ئیتر نابێ بەتەمابین پەندی کۆمەڵێکی دواکەوتووی دەستەوئەژنۆی وەکوو کورد گەرمایی خەباتێک بداتەوە کە نەبووە وەیا بەزاری چینێک بدوێ کە سەربەخۆ نەدواوە.

ئەو واقیعەی لەنگەری لەسەر چاکە و خراپە و جوانی و دزێوی و ڕەوایی و ناڕەوایی و تەواوی و ناتەواوی و زۆر شتی بێلایەنیش بەستبێ دەبێ پەندێکمان پێ ببەخشێ کەوا، کەم و زۆر، لەنگەری لەسەر ئەو بنەمایانە بەستبێ. هەرچەند دەشێ بابەتی «وشە» کە پەندیش هەر وشەیە، بەپێی مەیلی ئاخێوەر وەیا هەستی دەروونی، سنووری مەیدانە جوداکانی واقیع ببەزێنی و پتر لە هەڵکەوتی کۆمەڵایەتی بەلای چاکە وەیا خراپە، جوانی وەیا دزێوی، ئازایی وەیا ترسنۆکی... دا بڕوات چونکە وشە بێ ئەرکە و چ مەسرەفی تێ ناچێ لەمپەری ماددیشی نایەتەبەر بیوەستێنێ.

خولاسە بەشێکی زێدە بەرچاوی ژوورخانی کورد لە ژێرخانی کوردەوە سەری نەکردوە چ جای ئەوەی لە تاکە ماکی فیۆدالیزمەوە هەڵستابێت. خۆ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ بەر لە 1300 ساڵ کە ئیسلامەتی تێدا لەناو کورد بڵاوبۆوە دەبینین لە ماوەی چەند ساڵێکدا سەرلەبەری «ژوورخان»ی کوردی لە زەردەشتیەوە بۆ ئیسلام گۆڕا، هەرچی «ژێرخان»ی ماددی کوردیش هەیە وەک زەوی و گاڕەش و مشار و پێمەڕە و ڕەز و پاوان و چنین و تەنین... هەر ئەوە مایەوە کە لە دێرینەوە بۆی مابۆوە، کە ئیتر قسە لەوەدا نەما بڵێین، وەک مامۆستا ئەمیر دەڵێ، دەشێ «عرض» لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێک جوداوازی هەبێ چونکە لەم حاڵەتەدا ژوورخانەکە پێوەندی نەک هەر بە ژێرخانی کوردەوە بەڵکوو بە کوردەکە خۆیشەوە نەبوو.

ئنجا ئەگەر بابایەکی ماددی بێت و بڵێ ئسلامەتی هەرچەند پێوەندی بە ژێرخانی ماددی کوردەوە نەبوو هەر نەبێ لەنێو عەرەبدا ئەو ژێرخانەی هەبوو کە هەر دەکاتەوە پێوەندی سەبەبی نێوان ژێرخان و ژوورخان، پێی دەڵێمەوە بەشی هەرە زۆری باوەڕی ئیسلامەتی درێژەکێشانی ئایینە ئاسمانیەکانی بەر لە خۆیەتی بەو پێیە ئەگەر تەعبیری ماددی بخوازینەوە دەبێ بڵێین ئیسلامەتی بۆ عەرەب ژوورخانی ژوورخانێکی بێگانەیە، ئیتر با خوێنەر لێکبداتەوە چۆن شیا لە کوردەوەریدا ژوورخانی ژوورخانی ژوورخان باڵ بەسەر ژێرخانی کوردیدا بکێشێت و، زۆر بە سەیری، تەقڵە بە واقیع لێبدات و ئیسلامەتیەکە ببێتەوە سەرچاوەی گۆڕانی «ژێرخان»ی کوردی. تەنانەت لە ڕووپەڕەی فیۆدالیزم و موڵکایەتیدا دەستووراتی دابەش کردن و بەمیرات گرتن کە لە قورئانەوە بەسەر مەسەلەکەدا دابەزی گۆڕانێکی بنجی خستە جۆری کەرت بوونی مڵکایەتی و بەمیرات گرتن.

دەتوانم بڵێم دیاردەی هەڵدانی هەندێ لە بنەماڵەی کورد بە ناوی ئافرەت ئاکامی ئەو پشکە میراتەیە کە ئیسلام بۆ ئافرەتی داناوە، زۆرجارانیش بە گردی کەوتۆتە دەستیەوە. [لێرەدا پێویستە دەستووراتی میراتی زەردەشتی و ئیسلام بەراورد بکرێ].

بگەڕێینەوە بۆ زەویداری و دەرەبەگایەتی.

وەک گوتم، کورد بە دەگمەن نەبێ دەرەبەگی نەبووە. بەڵام لە بەدیهیە ئاشکراترە کە خاوەن زەوی هەبووە. «خاوەنایەتی» لە هەموو ئەو شتانەی دەشێ «مەملوک» بن فەرمانی ژیان و گۆزەرانە بەر لەوەی شەقڵی قۆناخی مێژوویی و فەرمانی هۆی بەرهەم بێت. هەر چونکە شەقڵی قۆناخیش نییە بۆیە جۆری مڵکایەتیی شتان هەزاران ساڵ بەردەوام دەبێ و چەندین قۆناخان دەپێچێتەوە. لە شەش هەزار ساڵ پترەوە مرۆڤ خاوەن زەوی بوە ئێستاش کە گەیشتە پلەی سۆشیالیزم خاوەنایەتیەکە بەردەوامە، وا دەزانم ئەگەر لێی

گەرێن لە پلەی کۆمیونیزم بەولاتریشەوە بەردەوام دەبێ و سوودیش دەبەخشێ، بەولای سودەوەش بۆ خاوەنەکەی دەبێتە مایەی بەخۆدا ڕاپەرموون و باوەڕ بەخۆ کردن، ئنجا باشتریش هەستی مەفتەنپەروەری دەکات.

لەعنەت کردن لە زەویداری بەهۆی دزێو کردنیەوە لە ژێر سەرەناوی فیۆدالّیزمدا وەک لەعنەت کردنە لەو تەمەنەی مرۆڤی نێرینە تێیدا مووی ڕیش و سمێڵی لێ دەڕوێت و مووەکەش هەتای مردن بە دم و شەویلەیەوە دەمێنێت. هەروەک مرۆڤی بێ دەست و قاچ نەدیتراوە هەروەها مێژووی بێ مڵکایەتی نەبووە و نە دەبێت. تەنانەت «عەبدایەتی» کە دزێوترین جۆری مڵکایەتییە دیاردەیەکی ناچاری بووە لە مێژوودا هەرچەند دەیەکی مڵکایەتی «شت» حەتمی نەبووە کە دەزانین لە هەموو میللەتێکدا عەبدایەتی دیاری نەداوە. مڵکایەتی بە واتای فرەوانی لەو قۆناخەشدا هەبووە کە پێی دەڵێن قۆناخی شیووعیەتی سەرەتایی چونکە «هاوبەشایەتی» ئەو قۆناخە لەو شتانەی مرۆڤی پێ ژیاوە لە سنووری بەرتەسکی خێزاندا بوە نەک هەموو ئادەمیزاد وەیا هەموو قەبیلە، خێزان و خێزانیش لەسەریان بەشەڕ هاتوون. تا ئێستاش جۆرێک هاوبەشی لە سنووری «خێزان» دا هەر هەیە. لەو جغزە زیدە تەسکەی «هاوبەشایەتی» خێزانیشدا مڵکایەتی سەربەخۆ لە پۆشاک هەبووە هەر نەبێ لەبەر ئەوەی پۆشاکی ئافرەت لە هی پیاو جودا بووە وەیا هی منداڵ بۆ گەورەی دەست نەداوە. تەنانەت مرۆڤ کە کەوتە سەر باری کێڵان و ئاژەڵ بەخێو کردنیش «مڵکداری خێزان» فەرمانڕەوا بوو. شێوەی ئەم هاوبەشایەتیەی خێزان لە بژێو و مڵکایەتیدا گەلێک دوای شیوعیەتی سەرەتایی بەردەوام بوو چونکە «خێزان» خۆی بۆ ماوەی هەزاران ساڵ خشتی دیواری کۆمەڵایەتی بووە ئەندامەکانی لە دایک و باوک و خوشک و برا و بووک هاوبەشی خۆشی و ناخۆشی خێزان بوون و هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە بە فەرمانی بەرژەوەندی موشتەرەک خەریکی سوودی خێزان و ڕەواندنەوەی تەگەرەکانی بووە. تەنانەت بووکی لە لاوە هاتوو پتر لە کیژی

شووکردوو هاوبەشی بژێوی خێزان بووە. بێگومان لەو ناوەشدا، «باوکایەتی» وەیا «هێزی نێرینە» جۆرە قسە ڕۆیشتنێک و چاوسوور کردنەوەیەکی بۆ خۆی ڕەچاو کردووە، کە دەشبوو هەروەها بێ چونکە دەبینین لە باری ئێستاکەی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئابووری و ئایینیشدا قسە ڕۆیشتوو چاوسوورکەرەوە هەر هەیە.

مەیلەو بە درەنگەوە، لەچاو عومری پلەی شیوعیەتی سەرەتایی، مافی تاکی دەسەڵاتدار لە نێوان ئەندامانی یەک خێزان خۆی سەپان بەو جۆرەی پێی بگوترێ «ملکایەتیی تاک» بەڵام دەبێ بزانین ئەوساش ئەندامانی خێزان دووچاری مەغدوورەیت نەبوون وەک لە ڕواڵەتدا هاوبەشایەتیان تێچوو، چونکە ئەو سوودەی پێشوو کە لە بەرووبوومی خێزان پێیان دەگەیشت لێی کەم نەبۆوە: هەر لە منداڵیەوە هەتا تەمەنی ژنهێنان و شوو کردن پتریان لەو پشکە وەردەگرت کە ئەگەر لە سەرەتاوە بەسەریاندا دابەش کرابایە پێیان دەگەیشت، دواتریش کە خاوەن ماڵ دەمرد چی هەیبوو دەبوو بە میرات.

ملکایەتیی زەوی لە نەزەر کۆمەڵایەتی لێرە بەپێشەوە وەک لە نەزەر کۆمەڵانی گەلەک شوێنی جیهانی سەردەم شتێکی ڕەوا بووە لە ڕەوابوون بەو لاوە ناچاری بووە، بەڵکوو هێندە ڕەوابووە بیر لە ڕەوابوونی نەکراوەتەوە کوت و مت وەک مافی خانەداری و دوکانداری و مەڕداری و هەموو داراییەک. لە کوردستاندا بە درێژایی ئەو مێژووەی دەنگی بە ئێمە گەیشتووە دیاردەی «خوردە مالیک» بەرچاو بووە. لە زۆر ناوچەشدا ڕووپێوی تێکڕای زەویی خوردە مالیکان لە هی ئاغا و دەرەبەگ پتر بووە. ئەم خوردە مالیکە بەر هیچ مەفهوومی ستەمکاری ناکەوێ مەگەر خۆی ستەمی لە ڕەنجبەرەکەی کردبێ. حاڵ و باری خوردە مالیک بەند بووە بە هات و نەهات. لە نەهاتدا فەلاحی نیوەکار لە خوردە مالیک حەسایەوەتر بووە چونکە بە زیادەوە ئەرک و مەسرەفی بەرە جووتەکەی لە خاوەن زەویەکە وەرگرتووە، لەبەرکوت و بنخارمانیش زێدە پارووی چاکی قەپاندووە. لە وڵاتی کەمبڕشت

زۆر بەدەگمەن فەلاحی خوردە مالیک توانیویەتی جووتی ئێستر دابەستێ چونکە نرخ و مەسرەفی ئێستر چەند جار لە هی گاجووت پتر بووە.

لە خوردە مالیک هەورازتر زەویداری مامناوەنجی دێت کە چەند بەرە جووتێکی هەیە. لەویشدا جارێ زوڵمی سەر بە چینایەتی دەست پێناکات چونکە دەسەڵاتی سەلمێنراوی لەگەڵدا نییە هێندەش داهاتی لێناکەوێتەوە بەشی مەسرەفی زۆرداری بکات.

زوڵم و زۆری ئەو دەسەڵاتەی لە «زەویداری» سەر هەڵدەدات لەو بارەدا دەست پێدەکات کە تاکێک گوندێکی سەرلەبەری بێبەرهەڵستی هەبێ، ئەوساش زوڵمەکە و چەندوچۆنی «چەوساندنەوە» بەند دەبێ بە دوو ماکی جودا:

ماکی یەکەم: دڵ و دەروون و کەسایەتیی دەسەڵاتدارەکەیە هەر چەند لە شی کردنەوەی دیاردەی کۆمەڵایەتیدا تۆژەرەوە گوێ ناداتە بنەمای ناماددی و چاو دەبڕێتە ئەو بنەمایە ماددیانەی بەرەو چاکەن وەیا بەرەو خراپەن. لە چارەسەر کردنی گیروگرفتی کۆمەڵایەتیشدا خەریکبوون بە دەستووراتی کۆمەڵایەتیەوە دەبێت نەک بە پەند و ئامۆژگاری ئەخلاقی. بەڵام من لێرەدا نەهاتووم چارەسەری دەردی کۆمەڵایەتی بکەم هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە باسی ڕابردوو دەکەم کە دەستی کەسی ناگاتێ، ئیتر ڕێم هەیە هەوڵ بدەم چاوی خوێنەر بۆ سەر تێکڕای دیمەنی باس لێکراو بابدەمەوە. لەمەش بترازێ، بەر لەوەی تێکهاویشتنی سەدەی نۆزەدەم گۆمی داوەستاوی کوردستانمان بشلەقێنی زوڵم و زۆری خاوەنی تاکە گوند لە ئاکامی موعادەلەیەکەوە لەنگەری دەبەست کە کەرتێکی بریتی بوو لە مەیلی ئەو تاکە بۆ چاکە یا خراپە چونکە تەکاندەر و بەرتەکدەرەوەی «تەما و ترس» لەو سەردەمانەدا، هێشتان، نێوانێکی مەحکەمی «کۆمەڵایەتی» لێکی جودا نە کردنەوە. واتە پاڵەپەستۆی «زوڵم نەویستی» لە کۆمەڵەوە بۆ سەر حەز و

خوازی تاک، جاریێ زۆر بێهێز بوو، ئەو بێ هێزییە بە ڕۆشەنی جلوە دەبەستێ لەوەدا کە دوای تێپەرینی 150 ساڵ بەسەر شۆڕشی فەرەنسەدا حزبێک لە کوردستان پەیدا نەبوو ڕاستەخۆ لە دەروونی تێکڕای میللەتەوە هەڵقووڵێ و یەکسەر و بێ تەئویل تەعبیر لە خوازی ئەوان بداتەوە وەک خۆیان تێی دەگەن نەک وەک ڕۆشنبیرێکی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم لە مێشکی خۆیەوە بە وەکالەتی ئەوان و بێ پرسی ئەوان بەدەنگی دەهێنێت. ئەم ڕاستیەش سەر دەکێشێتەوە بۆ باس کردن لە ماکی دووەم.

ماکی دووەم: ڕادەی ڕابەرایەتیی دەستووراتی کۆمەڵایەتی لە مەیدانی ڕەفتار و بەرژەوەندی تاکدا کەوا هەر تازە لە هەندێکی دوام. بێگومان
پەندی «مست لە درێشە دەگەڕێتەوە» لێرەدا بە تەواوی ڕاستە، لە بەراورد کردنیشدا دەردەکەوێ ئەو درێشەیەی لایەنی بێهێز و لات لێی دەگەڕێتەوە لەوانەیە بەلای دەسەڵاتدارەوە درێشە نەبێ، بەم پێیە یاسا و دەستووراتی کۆمەڵایەتی بەلای خاوەن تاکە گوندەوە کەمتر لە درێشە دەکات تا دەگاتە فەلاح و جووتیار بەڵام بەلای سەرۆک عەشیرەتەوە کەمتر درێشەیە تا دەگاتە خاوەنی تاکە دێ. لەمەوە دەشێ بڵێین خاوەنی تاکە دێ کە ڕابگیرێ لە نێوان خوردە مالیک و فیۆداڵدا بەلای خوردە مالیکدا دەچێتەوە، چ لە ڕووی داراییەوە بێت و چ لە ڕووی زوڵم و زۆرەوە بێت.

پاش ئەم پلەیە ئنجا «خاوەن مڵکی فرە» دێت کە چەند گوندێکی هەبێت. ناتوانین لێرەدا عەیارە دابنێین بۆ واتای وشەی «فرە» ئایا دوو گوند، سێ گوند وەیا پتر دەخوێنێتەوە بەڵام دەتوانین بڵێین:

1- هەتا ئەو گوندانە بەسەر یەکەوە بن و «ناوچە» دروست بکەن پتریان بە بەرەوەیە «دەسەڵات» دروست بکەن.
2- ئەو هەرێمانەی زەویەکانیان کەنفت و کەمبرِشتن خەلقەکەشیان کەنفت و هەژار دەبن و زووتر خاوەن دێیان لێ دەبێ بە دەسەڵاتدار.

حکوومەتیش لەو شوێنانەدا ڕێزی خاوەن گوندی ئەوتۆیی پتر دەگرێ لە یەکێکی وەک ئەو کە هەرێمەکەی بە بڕشت بێت چونکە هەرێمی بە بڕشت هەم فەلاحی تێروتەسەلی چاونەترساوی دەبێت و هەم بە دەوریشیەوە ملکداری دیکەی بەهێز و پێز زۆر دەبن.

3- بەپێی دەسەلاتی حکوومەت دەسەلاتی ملکدار دادەلەنگێ. لە سەرووی ئەم پێپیلکەیەی «خوردە مالیک و مالیکی مامناوەنجی...» ی دەسەلاتدا فیۆدالْ دێت، وەک گوتیشم لە کوردەواری فیۆدالْ هەم دەگمەن بووە و هەم لە ڕووی دروست کردنی «ژوورخان» ـەوە نەزۆک بووە.

ئێلی ڕەوەند و عەشیرەتی نیشتەجێ حسابیان لە حسابی ملکدار و فەلاح جودایە. ڕەوەند سەرۆکی هەیە، گەورە و چووکە و دەولەمەند و هەژاریشی هەیە، بەلام لەبەر جۆری گوزەرانیان کە بەندە بە پاوانی زستانە و هاوینە و هەمیشەکات ڕوبەڕووی خاوەن پاوانی سەرەڕێی کۆچیان دەبن و لە دەولەتێکەوە بۆ دەولەتێک هاتوچۆ دەکەن، مەڕ و ئاژەل و ولاغیشیان زیندە مالی دزبردووی گورگخواردووی مەرگتێگەڕاوە کەسیان ناپەڕژێتە بیر کردنەوە لە زولم و دەستبەسەردا گرتن، جگە لەوەی کە مومکین نییە گیسکی هەژارترینیان بدزرێت و دزەکەی نەناسرێ، ڕەوەند وەک خێزانێکی گەورەی گەڕۆکە، بەبەریەوە نییە دەستدرێژی ناوەکی لە عادەت بەدەری تێدا بکرێ، هەرچی ئێلی نیشتەجێیە پلەیەکی ناوەندیە لە نێوان ڕەوەند و کۆمەلگەی فەلاح کە لە دەمێکەوە پێوەندی عەشیرەتی نێوان فەلاح و سەرۆکی ئێل تێیدا سست بووە وەیا هەر بەجارێ ون بووە.

نووسەرانی مێژوو و کۆمەلایەتی و کۆمەلایەتی سەر بە ئابووری و ڕامیاری لە بارەی ژیانی کۆچەری و عەشیرەتی کورد، وەیا تێکڕای ئێل و عەشیرەتان، گەلەک قسەی لە یەکدی جودا دەکەن، هی وەهاشیان تێدایە کۆمەلگەی کۆچەر و عەشیرەت وەک پۆلی فرشتە لە قەلەم دەدەن: لێرەدا پەکمان لەسەر بیروڕای ئەو نووسەرانە نەکەوتوە چونکە لە بابەتێک دەدوێین ڕەنگە

ئێمەی کورد پتری شارەزا بین. من لەو ناوەدا ئەوەندە دەڵێم، لە میللەتی بەوەلەد نەهاتووی وەکوو کورددا زۆر زەحمەتە زوڵم و زۆر لە قەبەڵ بەرەیەک وەیا چینێک بکەی چونکە لە 2500 ساڵ پترە کورد یەکێتی بەخۆیەوە نەدیتووە هەتا یەک قسەی سەرانسەری کۆمەڵایەتی لە بارەی هەموویەوە بکرێ، حکوومەتیشی نەبووە بە بۆرە تەئویل بکرێتە وەکیلی فڵانە چینی کورد: ئەگەر کورد میللەتێکی بە وەلەد هاتوو بوایە ئەویش وەکوو میللەتانی دیکە فیۆداڵەکەی نمای دەکرد بەرەو قەبارەی حکوومەت، کەچی هەر بنەماڵەیەکی کوردەواری گەیشتبێتە ڕادەی حوکمداری چەپەڵۆکێکی هێزی بێگانەی لە خۆی زاڵتر تەفروتونای کردووە.

وەک من بۆی دەچم هۆی ئەم مومکین نەبوونەی پەیدابوونی حکوومەتی کوردی لە ماوەی 2500 ساڵدا دەگەڕێتەوە بۆ دیاردەی «نزیف اقتصادی» کە لەوەتەی ئیمپراتۆریەتی فارس و هی ڕۆمەکان و یۆنانیەکان و دەسەڵاتی جێنشینەکانی ئاشوور و بابل دەوری لە کوردستان داوە داهاتی خاکی کورد ساڵانە ڕژاوەتە ئەم سێ ناوچە بەهێزەی ئابووری و حوکم و ئیمکان نەبوو بە درێژایی مێژوو «سەرمایە» و دارایی بایی حوکمڕانی لە نێو کورددا پەیدا بێ. لە نووسینی دیکەمدا باسی ئەم «نزیف» ـەم کردووە، لێرەشدا ڕێم نییە لەسەری بڕۆم، چی تازەش گوتم هەر بەو نیازە بوو کە تابلۆی نەبوونی فیۆداڵی کورد و حکوومەتی کوردی لە چوارچێوەی سیخناخ بوونی کوردستان لە نێوان سێ ناوچەی گەورەی هێز و دەسەڵاتدا ببێتە دیاردەیەکی مێژووکردی حەتمی مەفهووم، لەوەش بەو لاوە ڕۆشنبیری کرد دەتوانێ پڕ بەدڵ پیرۆزبایی پەیدانەبوونی فیۆداڵی کورد و دەوڵەتی کورد لە خۆیی و لە کورد و لە دوژمانی کوردیش بکات وەیا حەسرەت بکێشێت کە کورد وەک میللەتان بەهرەمەند نەبوو لە زوڵم و زۆری فیۆداڵە نەڕسکاو و نەزاوەکەی کە لە پزدانی مێژوودا مردەزاد بوو.

له لایەن ستەمێکی کوردیش له کوردی کردبێ، بێ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ نەزەریەکانی سەر بە کۆمەڵایەتی و ڕەوتی مێژوو، گەلێک گوتەی پەندئامێزی کۆنینە و گەلێک تەجرەبەی ڕۆژانە فێرمان دەکات کە هەمیشە ترسی زوڵم لە سەرانسەری دەفتەری هەموو حساباتماندا هەبێت: قورئان دەڵێ «ان النفس لاماره بالسوء» … منداڵی ساوا هەتای پێی بکرێ دەست بەسەر شتی غەیردا دەگرێ… هاوڕێی خەباتت هەتا بێدەسەڵاتە مێرخاستر و براترە. دیارە خاوەند یەک گوند و دەگوندیش یەکێکە لەو مرۆڤانەی ترس و تەما دەیانگێڕێت: ئەویش لە ئەنجامی موعادەلەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر لایەندا کە ترس و تەما و بەرژەوەند و یاساکانی دونیایی و ئایینی و خەسڵەتی زاتی و تانووتی دەوروبەر و پێدزیکلەی حەز و سەنگرانەوەی شەرم و بزوێنی بەزەیی و ڕق و لایەنگیری و دوژمانیەتی… و … سەدان ماکی دیکەی چاک و بەدی تێدا بەشدار دەبێ، پێ لەسەر تەماعێک دادەگرێ کە بەعادەت بەرەو سوودە نەک زیان مەگەر هەڵەی لە حسابدا کردبێ وەیا پاڵەپەستۆی نەوسنایەتی سنووری پێ دابەزاندبێ وەیا ترسنۆکی لە جڵەوی تەماعیدا بێتەوە…

هەرچەند دەشزانین پەلەی ژیان و پێداویستی گوزەران لە بنەڕەتدا خۆویستی و خۆسەپاندنە، نابێ لەبیر بکەین کە پەیدابوونی موڵکداری مامناوەنجی و ملّکداری بەرەو ستەم لە هێلکەدانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و بەسەربردنی سەرەتایی کەموکەسردا ڕووداوێکی ناچارییە نەک زەنەی نەفسی حەزۆک و مەیلی نارەوای دارایی لە چەند کەسێکی نامزەدکراوی غەیب وەیا جنۆکە دەست لێوەشاندوودا دەبێتە عەیب و عار و لەعنەتی مێژوویی: لەو پلەیەی کۆمەڵایەتیدا کەس نەبووە حەز نەکات چەند پارچە زەویەکی بە پیت و بڕشتی هەبێ وەیا حەز نەکا بتوانێ بەسەر چەند «دەست و پێ» یەکدا بنەڕێنێ، تەنانەت هەر یەکێک لەو فەلاحانەی دەستیان بەسەر خەڵقدا ڕاناگا، لە سنووری دەسەڵاتە سستەکەیدا چاو لە زەعیفتران سوور دەکاتەوە، زۆرجارانیش بە لاپرەسەنەیی مرۆڤی بێ چارە بۆ دەسەڵاتدار دەشکێنێتەوە.

کار و بازاڕی ئەم جیهانەی وا مرۆڤی تێدا هەڵدەسووڕێ بگرە لە گەمەی منداڵانەوە هەتا دەگاتە سەرۆکایەتیی دەوڵەت هەمووی لە شێوەی هەڕەمدا دەسەڵاتی دواین پلە تەسلیم بە تاک دەکا. چاو بە دەوری خۆتدا بگێڕە دەبینیت هەرچی دامەزراوی ڕەسمی و ئەهلی و ئایینی و دنیایی و کۆمەڵایەتی هەیە لە سەرووی هەرە سەرەوەیدا تاکێکی تێدا بەرپرس و لێپرسەوەیە. ئنجا بە زۆری، سەرلەنوێ هەرەمێکی نوێی دەسەڵات لەسەر زەقایی تۆپەڵەی ئەو بەرپرسەوە تێهەڵدەکشێ، ئەگەر بەر لە 4000 ساڵ بەهۆی سادەیی ژیانەوە بابایەکی دادخواز وەیا داواکار هەر ناچاری چوونەوە لای سەرۆکی دوو هەرەم بووبایە، ئێستا لەبەر هەزار و بیست سەبەب هەمان داواکار سۆمایی چاوی دادێ هەتا ئەو هەموو هەرەم لەسەر هەرەمەی ناحیە و قەزا و پارێزگە و پایتەخت و لکە بێئەژمارە شیرازەهۆنکراوی دەوڵەتی نوێ، ژووراوژێرە دەبڕێ.

لە تەجرەبەی خۆمدا دووچاری مراجەعەیەک بووم لە سەرەتای 1957 دا دەستی پێ کرد و لە هاوینی 1977 بە نیمچە دۆڕاوی کۆتایی هات. وەک دەشزانین لەم ڕۆژگارەدا پێبەپێی بەرەو پاش بوونی کۆمەڵ مامڵەت کردن لەگەڵ لووتکە هەرەمەکاندا تەنگتر و بێدەرفەتر و سەرشکێنتر دەبێ.

بێگومان ئەوەی لێرەدا دەیڵێم دادوبڕۆ کردنە نەک پێدا هەڵگوتن، ئنجا کە دێم چاو هەڵدەئەنگێوم بۆ ڕۆژگاری ڕابردوو خاوەن زەوی و گوند و مام فیۆداڵ و جندرمە و جەردە و عەوامخەڵەتێن و سوودپەرست و جەنگخواز... و... ی تێدا دەبینم، لەگەڵ هەموو پەرۆشیەکەم لە ئاست ئەو ستەم و نارەوایەی لە هەژار و بێدەسەڵات کراوە ئاگام لەو ڕاستیانەی خوارەوە نابڕێ:

1- زوڵمی زۆرداری بەر لە 5000 ساڵ و 1000 ساڵ کەمتر جێی سەیرهاتنەوەیە.
2- ڕازیبوونی ئەم سەردەمە پتر جێی سەیر هاتنەوەیە.

3- زۆربوونی لووتە هەرەم لەم سەردەمەدا ڕووسپیکەرەوەی حامووڕابییە.
4- نایەم لە جیاتی مام بارامی ساڵی 1500 شەڕ بە دارا بەگی ساڵی 1500 بفرۆشم.
5- بەدەنگ هێنانی هەژاری خامۆشی بەر لە 200 ساڵ و 300 ساڵ ناکەم بە ئەرکی سەر شانی خۆم بۆ هەڵفریودانی خوێنەری ئەم سەردەمە بەرەو ئامانجێک پەکی لەسەر دەستخەڵاتاندن نەکەوتووە.
6- کوتانەوەی زوڵم و زۆری عادەتی دەسەڵاتدارەکانی بەر لە 100 ساڵ و 500 ساڵ ئەو ڕاستیەم لەبیر ناباتەوە کە ئەگەر زاڵمەکانی کورد تێکڕایان وەکوو «ئەبوو زەڕڕی غەففاری» بانایە، چارەنووسی کورد هەر ئەوە دەبوو کە ئێران و توران بۆیانی کردووە بە قەبری تێدا تلانەوەی مێژوویی.

ئەمانە و گەلێک ڕاستی دیکەی کاریگەری مێژوومان لەوانە نین بە پەرۆشی سۆفی مەشرەبانەی دەستوپێ سپیلکانەی فرمێسک درۆزنانەی سەر شێواوانە بۆ زوڵمی تێپەڕیوی سەد ساڵەیی و هەزار ساڵەیی لە حسابان بسڕینەوە و فەرامۆش بکرێن. بێگومان ئەگەر کار و بازاڕی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ ئەوە نەبوایە کە «تاک» لە سەرووی هەرەمدا دەکات بە فەرمانفەرما هەر بەهۆی دروست نەبوونی هەرەمەکەی دەسەڵات و پەیدانەبوونی ئەو فەرمانفەرمایە، میللەتی کورد و هەموو میللەتێکی دیکەی وەک کوردیش لە زۆر و ستەمی بێگانە و فەلاکەتی هوروژمی داگیرکەر و تەماعی دراوسێی چاوبرسی ڕزگار دەبوو، ئنجا لە نێوان خۆیشیدا لووتە هەرەمەکان بەرلەوەی برسکێن دەپوانەوە و دەستیان لە میللەت کۆتا دەبوو.

چەند سەیرە بیرکەرەوەی ماددی لە گۆڕانی مێژوویدا دەسەڵاتێکی وەک هی خودا دەداتە هۆی ئابووری خوێڕیی بێبایەخ و بێنرخی وەک مشار و داس، کەچی ماددیەتیەکەی لە ئاست ئەو دیاردە ناچارییەی کۆمەڵگەی شکل هەرەمی کە بەپێی داخوازی بەڕێوەچوون و پەلەی ژیان دەسەڵاتی تێدا بە

تاک دەدرێ، ئا لەوێدا ماددیەتیەکەی خامۆش و لاڵ دەبێ، ئنجا هەرچی جێبەجێ کردن و بزووتنەوەیەکی بەرەو پێش لە فەلسەفەی ماددیەوە سەری هەڵدابێ کێشاوەتیەوە سەر بەرەو ژوور بردنی لووتکی هەورازی هەرەمی دەسەلات: هەرگیز لە مێژوودا «مافی خودایی مەلیکان» نەگەیوەتە پایەی بێشەریکایەتیی ستالین و ماو و کیم ئیل سۆنگ.

ئەم تێنەخوێندنەوەیەی دیاردەی ڕسکانی هەرەم ئاسایی کۆمەڵ لەوەتەی مرۆڤ پێی ناوەتە کۆڕی مرۆڤایەتیەوە، لە لایەن بیر کردنەوەی ماددی کە چاوی بڕیوەتە هۆی بەرهەمهێنان و بەس، یەکێکە لە هۆیە هەرە زلەکانی سڵەمێنەوەی بیری ماددی لە دەوری «تاک» لە مێژوودا: هەر چونکە دیمەنی هەرەمەکە لە پەنا تارمایی ئەزەلی و ئەبەدی «هۆی بەرهەمهێنان» دا حساببەدەر کراوە، فەلسەفەی ماددی لێی گران دێ یەکسەر بەشێکی بایەخی پلەی مێژوویی و جەماهیریەت و هۆی بەرهەم ڕاگوێزی بۆ ئەو تاکەی کە ماددیەت خۆیشی دەزانێ چ دەسەڵاتێکی بێ ئەمانی هەبووە و هەشیەتی. ئەگەر ماددیەت حسابێکی دروستی کردبایە بۆ ئە هێز و دەسەڵات و شکۆیەی لە سەرووی هەرەمی کۆمەڵایەتیدا هەیە کۆمەی نەدەکرد لە دانهێنان بە دەوری ئەو تاکەی کە دەگاتە لووتە بەرزەکەی شکۆ و دەسەڵات.

دەبێ بزانین سەرۆکی سپا، سەرۆکی وەزیران، سەرۆکی کەنیشتە، سەرۆکی نیقابە، سەرۆکی عەشیرەت، سەرۆکی مزگەوت، سەرۆکی دەوڵەت.... تاکی عادەتی نین. هەر یەکێک لەمانە بریتین لە «تاک + دەسەڵاتی شوێنەکەی». تۆ بێنە لویسی چواردەم لە مەلیکایەتی بێخە و بیکە بە شەربەتفرۆش، لە بیری دەبەیتەوە کە جارێکیان گوتبووی «خۆم دەوڵەتم» ناشوێرێ بڵێ «خۆم دوکانەکەمم» چونکە دەشێ دوکانەکە هی خۆی نەبێ.

سەرنج بگرە دەبینیت شکۆی تاک لە شکۆی پایەیەوە دێت، ئنجا لێهاتوویی خۆی بە چاکە بێت یا بە خراپە. تۆ سەیری ئەو کەسەی کە بە میرات شکۆ و دەسەڵاتی بۆ دێت چەند بێ ئەرک و مەسرەف دەگاتە پایەیەک لە شۆرەت کە پاڵەوانێکی لێزانی ئازای هەڵمەتبەر لە بنی هەرەمەوە بە خۆبەخت کردن و مل لە چەقۆ خشاندن دوای ساڵەهای خەبات ڕەنگە بە دەیەکی ئەو شۆرەتە نەگات وەیا هەر بەهیچی نەگات. لەخۆوە دیاریشە ملنان بۆ ئەو تەرزە لووتە هەرەمەی دەسەڵات بەو عەزاب و مەترسیەی تێیدایە لەوەوە دێت کە خێر و خۆشی جێگاکە شتێکی زۆر و زەبەندە و حازر و بزریشە هەر دەیەوێ بیگەیتێ: ئەگەر هاتبایە بابای بەتەماع و بڵندنۆڕ ناچار بوایە خێروخۆشی جێگاکەش بە هەوڵی شان پێکەوە بنێت لزومی نەدەدیت ڕۆحی خۆی بخاتە مەترسیەوە، دەچوو بەو مەسرەفە ئۆتێلی دەکردەوە.... تیجارەتی لێ دەخوری... پاپۆڕی لە بەحران دەگێڕا.

ئا لێرەدا قسەیەکی پەرەسەندووی بێ کەڵک و بایەخ لە قامووسی شۆڕشگێڕی دەهێنمە بەرتیشکی ئەم لێکدانەوەیە: زۆرجاران دەگوترێ فڵانە کەس بە ترازانی لە ڕاستەڕێی گەلپەروەرییەوە بەرەو سوودی شەخسی و خۆپەرستی سەرەلێژبۆوە بۆ ناو گوفەکی مێژوو. گۆیە بەم توانجە ناوزڕێنە فڵانە کەسەکەیان نابووت کرد و ناویان سڕیەوە کەچی ئەو فڵانە کەسە بەتەما نەبووە موژدەیەکی لەوە خۆشتری پێ بگات چونکە هەموو ئاوات و ئامانجی ئەوەبووە بەهرەوەر بێ لە بەرەکەتی ئەو گوفەکە. تۆ ئەگەر دەتەوێ بابای ئەوتۆیی ئیفلاس پێ بکەیت و بە خەفەتانی بکوژیت ڕێی گوفەکی مێژووی لێ کوێر بکەوە، ئەو نرخەی تۆ بە ناوپاکی و پیاوچاکی دەبەخشیت بۆ پیاوی تەماعکاری دیناخواز و هەوەسباز ژاڵە و گوژاڵە....

چ ئەو تەرزە کەسە بەو گوفەکە بشکێنێتەوە و چ موسڵمانی ساغ بە نوێژ و و حەج عەیبدار بکەیت و چ نیشتمانپەروەر بە جانفیدایی ناوبەد بکەیت هەموو هەر موژدەدەر و دڵخۆشکەرەوە دەبێت. تۆ ڕێت نییە گوێزی ئەوان لە

هەمبانەی خۆتدا بژمێریت. بە نموونە دەڵێم ئەگەر باوکێک کوڕی خۆی ناردە پارێزی دزیەتی و یەکێک هات پێی گوت قوڕ بەسەر کوڕەکەت ئەوەندەی بزن و مەڕ دزی جەهەنەمی بۆ خۆی تەرخان کرد بێگومان باوکەکە لە خۆشیان هەڵپەڕکێ دەکات. بەلای منەوە قسەی وەها دوور لە واقیع هەر ئەوەندە سوودەی دەبێ بۆ خەباتگێڕان کە وەک دەرمانی هێورکەرەوە ئازاری نەساغی لە بن پەردەی درۆزندا دەشارێتەوە و بە شێوەیەکی هەست غەڵەتێن حەسانەوەیەکی بیژوکیان لە گوفەکنشینی کابرای دونیادۆستەوە بۆ دێنێ، بەمەشدا نەختێک عەزمی لەناوبردنی کابرایان لێ کەم دەبێتەوە، چونکە لە گوفەک نیشتن بۆ خۆی جۆرێکە لە سزا و تۆڵە.

ئەم گوفەکنشینیەی مێژووش هەر دەگەڕێتەوە بۆ دیاردەی شێوە هەڕەمی کۆمەڵایەتی، چونکە لەسەر لوتکەی هەرەمەکەوە پیت و بەرەکەتی نارەوا دەبێتە گوفەک.

لێرەدا ڕەنگە فکر زەلە بکات و دەوری «تاک» ی سەرووی هەرەمەکە لە ڕووداودا بداتەوە بە گەل لەو ڕووەوە کە گەل خۆی هەرەمەکەیە. بەڵام، بە ڕاستی دەست بەتاڵی گەل بەوەدا پتر ئاشکرا دەبێ کە بابای لوتکە نشینی هەرەمەکە هەموو ئارەزووەکانی خۆی بە ئەرک و مەسرەفی گەل جێبەجێ دەکات نەک بە ماڵە میراتیەکەی گۆڕخانانی: حەپس و دیلێکی بە زەبری قەمچی حەپسخانە بە دەوری خۆیانەوە هەڵنێن ڕێیان نییە بە شانازییەوە بڵێن تەماشاکەن چەند بە ڕێکی و جوانی لە کارەکە بووینەوە. حەپس و دیل لەوەدا شانازی دەکەن کە حەپسخانەکە تێکبدەن، گەلیش ئەو ڕۆژەی گوفەکنشینی سەرووی هەرەمی هەڵداشت مافی شانازی کردنی دەبێت بە مەرجێک ڕێی گوفەکنشینێکی دیکە نەدات.

بەردەوامبونی زوڵمی فیۆداڵ و هەموو لووتە هەرەمەکانی دیکەی کۆمەڵ بە درێژایی هەزاران ساڵ دەچێتەوە بۆ حەتمیەتی پەیدابوونی ئەو لووتانە و

بەندبوونی بەرژەوەندی گوزەران بە چوونەوەی دەسەڵات بۆ لای ترۆپکی هەرەم، ئەگەرنا چ تەفسیرێکی ژیرانە نابێ بۆ کڕنوو بردنی هەزاران هەزاری میللەت لەبەر دەستی چەند تاکێکدا: ئەگەر دەسەڵاتی ئەو تاکانە بەلای میللەتەوە جۆرە ڕەوایی و بەرژەوەند و کارگوزەرانیەکی گشتی تێدا نەبوایە خۆ ئاژەڵ نەبوون لە هەزار ساڵدا بەگژیدا نەیەنەوە. بەڵێ دەزانین عادەت گرتن بە هەر شتێک بێت جۆرە ڕەزامەندیەکی لێ پەیدا دەبێت بەڵام ئەو دەسەڵاتەی کەوا جارێ نەسەپاوە چ عادەت پێوەگرتنی لەگەڵدا نییە تاکوو پێ ڕاهاتنی ببێتە هۆی لێ ڕازیبوونی ئیتر بۆ دەبێ بسەلمێنین لە سەرەتای کارەوە تاکی ناپەسند وەکوو جادوو خۆی بەسەر میللەتدا بسەپێنێ؟ بۆچی زۆربەی میللەت بەر لە 5000 ساڵ تاکە تەماعکارەکانیان سەرکوت نەکرد، خۆ ئەو تاکانە بە خۆ و دەسەڵاتیانەوە لەگەڵ هەور و باران بەسەر میللەتدا نەباریبوون؟ ئەگەر بە جۆرێکی ئاسایی بەرژەوەندی گوزەران و خۆ پاراستن و پەلەی ژیان هەرەمی کۆمەڵایەتی بەمل کۆمەڵدا نەهێنابایە، نە زەوی و گاڕەش و گەنم و جۆ، نە قولاب و تۆڕ و ماسی، نە تەڵە و ڕێوی، نە خوری و موو و تەشی و خەرەک، نە ئاش و باراش، نە ئێستر و بارگیر و گوێزانەوە، نە بزن و مەڕ و گامێش، نە مازوو چنین و کەتیرە گرتنەوە و پووش و گزرە داگرتن، نە هەرچی جۆری بەرهەم و هۆی بەرهەمهێنانە لە خۆیەوە بێ تێخوێندنەوەی پێویست بوونی سەرۆک و ناوبژیکەر ڕیز ڕێکخەر و تانووت دەر ناتوانێ لە سەرەتاوە دوولنگەی تاکێک بەسەر شان و ملی 100 کەس و 1000 کەسدا بهێنێت.

تاکی دەسەڵاتدار ناتوانێ ڕاوی دوو کەروێشک بکات هەر چونکە کەروێشک بەرژەوەندی لە «ڕامبووندا» نییە، کە مەڕ و بزن و باربەر و ئاژەڵ بە تێکڕایی لە ڕۆژگاری کۆنەوە ڕامبوونیان لێ خۆشهات. ئنجا ئەگەر بێین و بۆ تاقی کردنەوەی «عەقڵی» خەسلەتە جوداکەرەوەکانی مرۆڤایەتی لە مرۆڤ دارنین و لە نوختە نەزەری سەلماندنی دەسەڵاتی تاکەوە وەک کەروێشک و ئاژەڵی سەیر بکەین بۆ دەبێ مرۆڤەکە لەو تاقی کردنەوەیەدا، بێ بەڵگە و بێ

هۆ و بێ بەرژەوەند و بێ فەرمانی واقیع بە لای ئاژەڵدا بچێتەوە و پەتی بەندایەتی و نۆکەرایەتی بخاتە ئەستۆیەوە؟ بۆچی کۆمەڵایەتی و بەرهەم و ئابووری نەیکێشایەوە سەر بێدەسەڵاتی تاک؟ ژیان و گوزەران و بەسەربردن و بەڕێوەچوون و زاووزێ کردن و کەیف و شادی و شین و ناخۆشی و هەرچی سەروبەری مرۆڤایەتی هەیە، بگرە لە بەرهەمهێنانەوە هەتا جگێنە و کەوشەک، هیچ یەکێکیان بەتەنها و تێکڕاشیان پێکەوە جڵەوی کۆمەڵ ناگرن بۆ بەردەستی زۆردار و خوێنمژ ئەگەر سروشتی بەڕێوەچوون لە بنەڕەتدا و لە پەراوێزی کۆمەڵایەتیدا داخوازی سەرۆک و ڕابەر و لێخوڕ و چاوسوورکەرەوە نەکات.

تەنانەت ئەو کەمتاکورتە مرۆڤە نەسەلمێنانەی کە هەستی زۆر بەهێزی لەخۆ ڕازیبوونیان پاڵی پێوەناون بەرەو ئازادی و ڕەهایی و خودبەسەری، داوە باریک و ئەستوورەکانی پێوەندی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی نادیار ڕایانکێشاون بۆ ناو جغزی ژیانی داوەستاو و قاڵبگرتووی وێنە هەرەمی. خۆ ئەگەر وەها ڕێککەوتبێ کە نارەزامەندی و نەسەلمێنی پەرەی سەندبێ تا ئەوەی بەشێکی بەرچاوی کۆمەڵی بەرەو جموجۆڵ و سەرکێشیەوە بردبێ، ئەوساش بزووتنەوەکە وێنەی هەرەمی وەرگرتووە و لووتکەی سەرۆکایەتی لە بزووتنەوەکەدا پاڵی بە «بنە» وە ناوە، لە حاڵی سەرکەوتنیشدا لووتکە هەرەمەکە جارێکی دیکە لەو میللەتە بۆتەوە بە دەسدرێژکەرە و خوێنمژ.

فکری ماددی کە دان بە شێوە هەرمیەکی چین لەسەر چینی کۆمەڵدا دێنێت لە دوو نوختەی زێدە گرنگەوە واقیع فەرامۆش دەکات:

1- وەها دادەنێت کە هەرەمی کۆمەڵایەتی هەرەمی ناتەواوە، واتە لە بری تیژایی لووتکەی سەرووی، کە سەرۆکی دەوڵەتە، چینێکی سەرلەبەری خوێنمژ و چەوسێنەرەوە کە زۆر تەسکترە لە بنەی هەرەمەکە، بە خۆیی و پاناییەکی هەیەتی، دەبێتە تەختایی سەرووی کۆمەڵ.

بێ ئەوەی ڕێم هەبێ بە درێژی لە ناتەواوی ئەم بۆچوونە بدوێم چەند تێبینیەکی تێدا دەردەبڕم بایی ڕوون کردنەوەی مەبەست بگات:

یەکەم: بە عادەت لە ژووورووی ئەو تەختاییەوە لوتێک هەیە سەربەخۆ و فەرمانڕەوا بەسەر هەموو هەرەمەکەدا نەک تەنها بەسەر چینی ژێروودا کە هەژارەکانن، بە درێژایی مێژووش ئەو لووتکەیە نارێک بووە لەگەڵ دەسەڵاتدارەکانی چینی سەروو، هەمیشە خەریکی دەفع کردنی گەزەندیان بووە و لێی کوشتوون، وەهاش بووە ئەوان کوشتوویانە. بە دەگمەن نەبێ تیژایی هەرەمی کۆمەڵایەتی بە دەستی میللەت نەڕووخاوە، لووتە هەرەمەکانی ژێر خۆی ڕماندوویانە. نەزەریەی ماددی کە وەها دادەبڕێ گۆیە دەسەڵاتداری سەرووی کۆمەڵ نوێنەری زوڵم و زۆری چینی سەرووی کۆمەڵ بووە جۆرێک «تعمیم» بەکار دەهێنێ گەلێک ڕاستی گرنگ و دیاردەی بەرچاوی واقیع دەسڕێتەوە. ئەویش بەنیازی پتەو کردنی بنەمای ماددی خۆی بەوەدا کە «چین» بگێڕێ کۆمەڵ بێ لایەنی ماددی و ئابووری مێژوو باشتر بە ئیسپات دەگات، لەوەی تاک بتوانێ لە سەرووی کۆمەڵەوە بگێڕ بێت.

میللەتێکی وەک کورد کە بۆی نەلوا لە ماوەی 2500 ساڵدا لووتکەی هەرەمی سەرۆکایەتیی دەوڵەتی هەبێ، بۆی لوا لە خانەی نیوەچڵی گۆڕانی مێژوویی بێ لووتکەدا هەزاران لووتکەی نزم و نیوە بەرزی سەرەک ئێل و زەویدار و ساماندار و سەرەک عەشیرەتی هەبێ کەوا هەرگیز وەک «چین» ڕەفتاریان نەکردوە. نەشیان دەتوانی وەها ڕەفتار بکەن، چونکە بارتەقای خەریکبوونیان بە دەستدرێژی کردنی نامەردانە و ترسنۆکانە لە میللەت، خەریکی یەکدی بڕاندنەوە بوون، خۆ لە پلەی عەشیرەتیدا هەمیشە بەشی هەرە گەورەی دەسەڵاتی سەرۆکەکان یەکسەر ڕووی دوژمانیەتی لە خۆیان دەکردەوە لە ڕێی «حیزەبەخۆیی» ئیتر بە دزی بێ یا بە ئاشکرایی.

تێنەخوێندنەوەی ئەم شەڕەی «نێوان چین» لە ڕووداو و لە گۆڕانی مێژووییدا، کە دەزانین دیاردەیەکی هەمە کات بووە، بە قەدەر هەڵبەستنی ئەو شەڕەی نێوان «چین و چین» کە ڕووی نەداوە بۆ تاکە نیازی بە ئیسپات گەیاندنی خەباتی چینایەتی لە مێژوودا، نیگای بینەر لێڵ دەکات و ڕاڕەوی ڕزگاربوون دەخاتە سەر هەڵدێری هەڵە. چ گوناهی مێژوو نییە چ بەردی کۆمەڵایەتی نالەرزێ لەوەدا کە خاوەن دەسەڵاتەکان خەریکی خۆخۆری بووبن وەیا هەژارەکان یەخەگیری خاوەن دەسەڵاتەکان نەبووبن... ئێمە ئەگەر خەریکبین مێژووی دەستکرد بخوێنینەوە، لە چارەسەر کردنیشدا دەردی دەستکرد تیمار دەکەین، ئەوەی لەو ناوەشدا خەسارەت مەند دەبێ میراتگری ئەو جەماهیرەیە کە بەزۆر لەسەر کاغەز بەگژ ئەسکەندەر و جەنگیزخانیاندا دەهێنین.

دووەم: لووتکی هەرە سەرووی کۆمەڵایەتی، کە نەزەرییەی ماددی بە نوێنەری چینی چەوسێنەرەوەی دادەنێت، بە پێی بەرژەوەندێک کە خۆی ڕەچاوی دەکات، دەشێ پشتیوانی لە میللەت بکات دژی خوێنمژەکانی، هەروەک دەشێ لە ناچاریدا هانا بباتە بەر خوێنمژ بۆ کۆ کردنەوەی هەستە و پیتاک و مەسرەفی بارەگا و شەڕ و ئاشتی. بەکورتی، ڕاگەیشتنی دەسەڵاتی سەرووی کۆمەڵ بەسەر هەموو کۆمەڵدا بەرژەوەندیەکی سەربەخۆ و جودا لە هی چینی خوێنمژ بۆ ئەو دەسەڵاتە پێکدەهێنێ ئیتر دەشێ جێبەجێ کردنی ئەو بەرژەوەندە بە جۆرەها وێنەی لەیەکدی جودا کە نایەتە بەر بڕیاری نەزەریەی «چینایەتی» ئەنجام بدرێت. فەرمانفەرمای کۆمەڵ هەروەک ئاشقی هەژار نییە ئاشقی جەردە و فیۆداڵ و دەسەڵاتداریش نییە، بگرە پتر لەمانە دڕدۆنگە هەر نەبێ لە ترسی هەڵگەڕانەوەی دەسەڵاتیان دژی خۆی، لەوە هەر بگەڕێ کە پشکێک لەو داهاتەی لە «رعیەت» وە پێی دەگات دەبێ بچێتەوە بۆ گیرفانی دەسەڵاتداری گەورە.

سێیەم: بوونی لووتکی هەرە سەرووی هەرەم کە دەکاتەوە سەرۆکی دەوڵەت، هەروەک خۆی لەخۆیدا مایەی پێشکەوتن و بە مافی نەتەوەیی گەیشتنە، لە لایەن کۆمەڵایەتیشەوە کرانەوەی دەروازەیە بۆ خێرایی کردن لە بڕینی ئەو مەودایانەی گیانی عەشیرەتی و ناوچەپەرستی و دیاردە تەسک و تروسکە سەرەتاییەکانی کۆمەڵایەتی تێدا بەردەوام دەبێ. تۆ سەیری چۆن پەیدابوونی ئەمیرێکی وەک پاشای کۆرە لە هەرێمی ڕواندزدا کێشایەوە سەر بەرەو پێشبردنی سەرجەمی ژیانی ئەو هەرێمە، کە دەزانین پاشای کۆرە دەستی بەسەر دەیەکی کوردستانیش ڕانەگەیشت، بە حاڵیش توانێ وەیا نەیتوانی هەناسەی حەسانەوە هەڵکێشێ. لە لایەن دابین کردنی هێمنایی و ئاسایشیشەوە بەر لە هەموو سەربزێوەکان، مامەکانی خۆی لەناوبردن.

من لە نووسینی دیکەمدا گوتوومە ئەو گەلەی بە مافە بنجیەکەی نەتەوایەتی نەگەیشتووە جارێ پێی نەناوەتە مەیدانی گۆڕانی مێژوویی وەک ئەو منداڵەی جارێ لە پزدانی دایکی نەهاتۆتە دەر. جار ئەگەر ئەم لێکچواندنەی گەلی بێکیان و منداڵی ناوپزدان لەسەرم حساب بکرێ بە قسەی شاعیرانە وەیا زەنەی هەستی بریندار، با بەبیر خوێنەر بهێنمەوە کە مومکینە میللەتەکەش و منداڵەکەش بەر لەوەی بڕسکێن مردەزاد ببن هەر وەک زۆر میللەتی لێرە بەپێشەوە لەژێر قاچی داگیرکەرەکەی خەفە کرا بەر لەوەی تاکە یەک ڕۆژ بە چارەنووسی خۆی بگات. گەلێک منداڵیش لە پزداندا دەخنکێن. نەڕسکانی میللەتی بێکیان بەوەدا پتر ڕوون دەبێتەوە کە دەزانین وەها بووە میللەتی خاوەن دەوڵەت دوای تێچوونی دەسەڵاتەکەی و زاڵبوونی بێگانە بەسەریدا خۆیشی تێچووە وەک سۆمەر و ئاکەد و بابل و عیلام.... و...

2- نەزەریەی ماددی وەها دادەنێ کەوا لەو هەرەمە ناتەواوەی کۆمەڵایەتیدا هەمیشە پاڵەپەستۆ و قورسایی چینی سەرەوە هۆی ناڕەزایی و هەڵگەڕانەوەی چینی خوارەوە بووە کە کێشاویەتیەوە سەر خەباتی بەردەوامی چینایەتی. ئەم ڕەنگڕێژ کردنەی چین لەسەر چینی کۆمەڵ بەهۆی تێکبەستنی قەوارەی

کۆمەڵایەتی بەدوای پێوەندی ئابووری و بەرهەمهێنان، لە ڕواڵەتدا، مەیدانێکی کۆمەڵگەی جەنگجۆی دڕدۆنگی توندوتیژ وێنەکێش دەکات کە سات لە دوا سات چاوەنۆڕی هەرا و بگرە و بەردەی چینایەتی بیت تێیدا. کەچی وەها بووە سەدان ساڵ بەسەر وڵاتێکدا تێپەڕیوە بێ ئەوەی چینەکانی بەگژ یەکدیدا هاتبێتنەوە، دیارە ئەمەش کاری شەیتان و جندۆکە نییە، داخوازی و ناچاری کۆمەڵایەتیە کە ئەم خاڵانە هەندێکیەتی:

ا- چینەکانی کۆمەڵ لە جیاتی ئەوەی جەمسەری گردەبڕ لەیەکدیان جودا بکاتەوە، پەراوێزێکی پان و ئاشکرای بەرژەوەند کە بریتیە لە تێکەڵبوونی سوودی مشتەرەکی دوو چین دەبوە پێوەندی گوزەران و بەیەکەوە هەڵ کردن لە نێوانیاندا کەوا هەم کۆمەڵایەتی بەردەوام دەکرد و هەم بەشێکی گەورەی «ناڕەزامەندی» هەڵدەمشت و دەیکوژاندەوە بە تایبەتی کە ناڕەزامەندی سادەی کەڕولال لە کۆنەوە نەیتوانیوە لە جیاتی نانێکی ڕەزامەندی کەرتە نانێکی هەڵگەڕانەوەش پەیدا بکات.

ب- چینی ژێروو کە بە فەرمانی پەلەی ژیان خەریکی کوێرەوەری بووە هیچ فەلسەفە و مامۆستاشی نەبووە، بەر لە 6000 ساڵ دەستی پێ لە ژیانی کولەمەرگی هەڵگرێ بۆ ئەو مەرگە بێ ئاکام و نەزۆکەی کە لە هەڵگەڕانەوەدا ڕووبەڕووی دەبوو. بابایەکی شارستانی ئەم سەردەمە بە خۆیی و کارەبا و فڕۆک و گەڕۆک و مەکتەب و جەریدە و مافی ئافرەتانیەوە کەوا بە درەنگەوە پەندی ناڕەزامەندی دەچێتە مێشکیەوە، بە زەحمەت دەچێتە سەرباری هەڵگەڕانەوەوە، نموونەیەکی هەرە هەرە هەرە پێشکەوتووە لەچاو کوردێکی هەزار ساڵ پێش ئیمڕۆکە کە لە ئاوێنەی نەزەریەدا قۆڵ و باسکی لێ هەڵماڵیوە دژی خوێنمژ، لە ئاوێنەی حەقیقەتیشدا باپیرە گەورە بێ جمجۆڵەکەی بێ تەوژم و تینەکەی بێ ڕابەرەکەی بێ هاندەرەکەی ئەو شارستانیەیە کە ئەگەر دەمەچەقۆی زوڵمی بێ سامان ئۆقرەی لێ هەڵنەگرێ

به تەما نییە داهاتی یەک مانگی بخاتە مەترسی تێچوون لە پێناو نارِەزایی و هەڵگەرِانەوەوە.

ج- نارِەزامەندی لە ژیانێک کە لە واقیعدا تاکە مومکین بێت و چ جێگیری نەبێ، هەر لە ناو توێژی نەزەریەدا کە هەمووی هەر قسەیە، کاریگکی ئاسانە بە تایبەتی لەو رِۆژگارانەدا کە بیر کردنەوە لە گۆرِینی ناوەرِۆکی کۆمەڵایەتی بە پێی پلانێکی دروست جارێ بە خەیاڵی تاکە بیرتیژەکانیشیدا نەدەهات. گۆرِانێکی عادەتی و لەسەرەخۆ وەیا بەدوا تێک هەڵقژانی دوو دەوڵەتدا وەیا تێک بەربوونی خاوەن دەسەڵاتاندا چ پێوەندی بە چینایەتییەوە نەبووە و نییە. ئەو جاروبارە لە دەگمەن دەگمەنترانەی کە نارِەزامەندی چینایەتی تێدا بەدی کراوە (وەک هەڵگەرِانەوەی سپارتاکۆس) سەرەرِای ئەوەی لە شوێنی پێشکەوتوو رِوویان داوە، هەر جارەش وەها تێ دەشکان دەبوونە عەزم شکێن نەک هاندەری دوارۆژ. کۆمەڵگە کۆنەکان، بەتایبەتی وەک کوردەواری کە هیچ مایەیەکی بەرەو پێش چوونی ماددی کاریگەری تێدا نەبوە، نموونەی کۆمەڵایەتی وەها سەرەتایی و دواکەوتووی تێدا بووە کە ئەگەر بنکەیەکی لەوانەی بیری ماددی بە خوێنمژ و سەرشێوێنی دادەنێ تێیدا پەیدا بووبایە، وەک دیوەخانە و مزگەوت و تەکیە، لێی دەبوو بە بنکەیەکی چاوکرانەوە و هەست بە دنیا کردن.

من بۆ خۆم پاشماوەی ئەو جۆرە کۆمەڵگەیەم دیتوە کە ئەگەر بڵێم خزمی ناوەرِاستی ئەفریقای بەر لە 400 ساڵ بووە لە واقیعم لا نەداوە. بێگومان وێنەی ئەم کۆمەڵگانە لە زۆر شوێنی کوردستاندا هەبووە کە من رِێم نەبووە بیانبینم، رِەنگە تا ئێستاش هەرمابن. ئنجا ئەگەر بە خەیاڵ مێژوو بەرەو دواوە هەڵگێرِیتەوە بۆ سەردەمی «ماد» و بەر لە «ماد» دەبێ بەتەمای چ دیمەنێکی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمانە بیت کە بشێ لە چوارچێوەی مەفهوومی بە فیزو نازی «نارِەزامەندی، خەباتی چینایەتی، هەڵگەرِانەوە، «ماهیە»ی فیۆداڵ و «عرض»ی بیرو عەقیدەو نەریت..» تێوەی رِامێنێت؟

چ ئەنجامێک لە چەندوچۆنی هەڵسوکەوتی خوێنمژ و خوێنمژراوی بەفرستانی دەرگەی مێژوو لەسەر داخراو بە بیرتدا دێت.

لە کتێبێکی ئینگلیزی لە ژێر سەرەناوی Propaganda دا کە ناوی نووسەرەکەی لەوانە نییە بناسرێتەوە وەیا لەیاد نەچێتەوە، خوێنمەوە دەڵێ «هەژاری» خۆی بەتەنها نابێتە ماکی شۆڕش: دوو تاقم بەرەو شۆڕش دەبنەوە، تاقمێکیان ئەو هەژارانەن کە داهاتیان زیادی کردووە و ئاهێکی لە جەرگی گێڕاون و داوای زیاتر دەکەن. تاقمی دووهەمیشیان ئەو تێرانەن کە داهاتیان کەم بۆتەوە و دەیانەوێ بچنەوە دۆخی جارانیان. ئەم ڕایە هەرچەندە لە پیاوێکی بێ ناوبانگەوە وەرگیراوە کە ڕای بگریت لە نێوان بیروڕای بەناوبانگی ئەم سەردەمە لە بارەی شۆڕش و هەڵگەڕانەوەوە، لەوان باشتر تێت دەگەیەنێ بۆچی وەها بووە لە ماوەی هەزار ساڵدا هەژاری وڵاتێک هەرای نەناوەتەوە هەرچەند جارەها و بارەهاش لە برسان مردوون.

ڕەنگە تێبینیەکی خۆم بدەمە پاڵ ئەو ڕایە و یارمەتی بدات لە گرتنی کەلەبەرێکی، بەوەدا کە بڵێم هەروەک دەشێ دەنگدانەوەی ڕابەر و هاندەر بەندبێ بە هەبوونی ئەو جۆرە تاقمانەوە، هەروەهاش دوور نییە یەکگرتنەوەی نارەزامەندی سەرلەبەری تاکەکانی ئەو تاقمانە پسپۆڕێکی هاندەر و وروژێنەری پێ بوێ ئەگەرنا ڕەنگە نارەزامەندی هەر تاکێک لە جغزی هەوڵ و هەڵپەی خۆیدا بوەستی و تێکەڵ بە کڵپەی دراوسێکەی نەبێ، ئیتر کارەکە لە بێ ئۆقرەیی تاکە نارەزامەندەکان تێپەڕ نەکات بەرەو هەڵگەڕانەوەی گشتی. بێگومان ئۆقرەنەگرتن و هەڵگەڕانەوەش کە حاڵ و باری سەرکەوتنی نەبێ سەرناکەوێ، خۆ لە ڕابردوودا هەمیشە کێشاوەتیەوە بۆ تێچوونی سەرلەبەری بزووتنەوەکە، چونکە ئیمکانی سەرکەوتنی نەبوە مەگەر ئەو سەرکەوتنەی بریتی بووبێ لە هاتنە حوکمی دەسەتەیەکی نوێ لە جێی دەستەی کۆن، ئاپۆرەی خەڵقیش هەر ئەو زۆر لێکراوە ماوەتەوە کە هەبووە.

د- له کۆنێکی کۆنەوە هەتا سەروبەری شۆڕشی فرەنسە، کۆمەڵایەتی بە تێکڕایی، پتر پەندی بە یەکەوە ژیان و بەیەکەوە گوزەراندن و بەیەکەوە هەڵ کردن و لەسەر یەکدی کردنەوەی گرتۆتەوە هەتا پەندی تێکبەردان و تێک هەڵقژاندن و بینەقاقەی یەکدی گرتن. مەرجیش نییە هۆی ئەم دیاردەیە بچێتەوە بۆ یەکچوونی بەرژەوەند، چونکە نارەزامەندی و هەڵگەڕانەوە لە تاکە هۆی بەرژەوەندەوە داناکەوێت: ئەو جوداوازییەی کە بەلای کۆمەڵەوە عادەتی و «خواکرد» بێت بیری لێ ناکرێتەوە چ جایی فەلسەفەی یاخیگەری لێ وەربگیرێ. بەڵام قسەیەکی سووک کە پێوەندی بە هیچ پێداویستیەکی کۆمەڵایەتییەوە نەبێ لەوانەیە شەڕەچەپەڵۆکی بەدوادا بێ: دزینی هێلکەیەک، خۆدانوساندن لە ناموسی غەیر، لێڵ کردنی ئاوی ڕوون، لەمپەرخستنە سەر ڕێی هاموشۆکەر، کەلێن تێخستنی چیلە و تامانی دراوسێ، دەر کردنی بەرخەگەل لە لەوەڕ، دەست وەشاندنی نابەجێ لە سەگی پاس، دەستبەزێن کردنی کەڵەشێر و نێرەکەوی نەبەز، داڵدەدانی سەپان و ڕەنجبەر.... و دەیان و سەدان حیزەفیعلی ئەوتۆی نارێکی و ئاژاوە و، زۆرجارانیش، هەرای ناوەتەوە کە هیچ یەکێکیش لەو کارە خوێڕوانە ناکێشێتەوە سەر چەوساندنەوەی چینایەتی بە زۆریش لە نێوان کەسانی یەک چین، نەک دوو چینی جودا ڕووی داوە. کە وردبیتەوە لە ڕووخسار و ڕواڵەتی کۆمەڵیش هەمان دیاردەی لێکڕازی بوون و لە یەکدی خواستنەوە و لە یەکدی پرسینەوە و بەشداربوونی خۆشی و ناخۆشی و ئەو جۆرە ڕەفتارە کۆمەڵایەتیانەی کە خزمن لەگەڵ هێمنی و بێ هەراییساڵەهای ساڵ وێنەیەکی گونجاوە لەگەڵ ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی.

ئەگەر هاتبایە جوداوازی بەرژەوەندی چینایەتی وەیا هی تاکان ئەو تیژکەرەوەیەی دوژمنایەتی بوایە کە نەزەریەی سەر بە ئابووری و چینایەتی بە بگێڕی مێژووی دادەنێت دەبوو دوو ئاکامی گەورەی لێ بکەوێتەوە:
یەکەمیان: لە یەکدی تاسپ بوونی چین و چین بە درێژایی ڕۆژگار.
دووەمیان: نەبوونی هێمنایەتی کۆمەڵایەتی، ئەویش بە درێژایی ڕۆژگار. هیچ

کامێکیش لەو ئاکامانە نە ئەو بەرچاوە بووە نە ئەو بەردەوامە بووە کە زاراوەی خەباتی چینایەتی و جوداوازی بەرژەوەند ڕای دەنوێنێ.

ئنجا کە نووسەرانی سەردەم دێن و لە جیاتی خەڵقی سەد ساڵ و هەزار ساڵ لەمەوبەر خوێنمژ و خوێنمژراو و ڕازی و ناڕازی و داد و ستەم، چاکە و خراپە ناودەبەن، ڕاستیەکەی، شەقڵی بیروڕای خۆیان لە بیروڕا و قەناعەت و باوەڕی ئەو خەڵقە بەسەرچووە دەدەن وەک ئەوەی مایۆی مەلەی «ڕیڤێرا» بەخەیاڵ لەبەر ئافرەتی کوردی بەر لە دوو سەد ساڵ بکەیت و دەستووری ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە لەو مایۆیەوە هەڵێنجیت.

هەموو ئەو پێوەندیە ئابووریانەی کە لەم ڕۆژگارەدا بە پێی باوەڕی شۆڕشگێڕان بە چەوساندنەوە ناو دەبرێ، لە ئەدەبیاتی شۆڕشدا بە نیسبەت هەزار ساڵیش بەر لە ئێستاکە هەر بە چەوساندنەوە دادەنرێ هەرچەند خەڵقی ئەو سەردەمەش لەو پێوەندیانە ناڕازی نەبوون، بگرە ئەدەبیاتی شۆڕش مرۆڤی ئەم سەردەمەش بە چەوسایەوە لە قەڵەم دەدات لە گەلێک حاڵ و باری ئەوتۆدا کە هەستی ناڕەزامەندی تێدا نەکردوە، تەنانەت دوای ساڵەها لە دەرس دان و هاندان ئنجا بەحاڵ لێی هەڵدەگەڕێتەوە، بە زۆریش شۆڕشگێڕەکان بەناوی ئاپۆرەی خەڵق یەخەگیری کاری ئەوتۆ دەبن کە خەڵقەکە لێی ناڕازی بووە واش دادەبڕن کە لەوەتەی کۆمەڵایەتی هەیە یەخەگیری ئەو کارنە بووە.

بێگومان کردنەوەی چاو و مێشکی گەل بۆ چارەسەر کردنی ئەو نالەبارییانەی کە لە خۆوە هەستی پێ ناکات وەیا بە درەنگەوە بیری لێدەکاتەوە وەیا ناوێرێ لێی بەدەنگ بێ ئەرکی سەرشانی بیریار و خەباتگێڕانە بەڵام بەهیچ کلۆجێک ناشێ لەم زەمینەدا دووخاڵی ژێرەوە لەبیر بکرێ:

1- کاری ئینساف نییە بە هەڵبەستن و سازدان وەها ڕانوێندرێ کە خەڵقەکە لە خۆوە بە پێی داخوازی زەرفی ماددی و بەرژەوەندی چینایەتی لە ئادەم و حەواوە خەریکی لێ هەڵگەڕانەوەی ئەو حاڵ و بارانە بووە. درۆ هەڵبەستن لە کۆمەڵایەتیدا گەلێک دزێوتر و تاوانبارترە لە درۆی عادەتی چونکە سەر دەکێشێتەوە بۆ ئەوەی خەڵق کۆمەڵایەتیەکی درۆزن بژیت.

2- ناشێ لە سنووری دەسەڵاتی عادەتی و ئازایەتی عادەتی بەولاوە داوا لە خەڵق بکرێ بەگژ ئەو شتانەدا بێنەوە کە ئەگەر لێی گەڕێن بەگژیاندا نایەتەوە. شۆڕشگێڕ نابێ ڕێ بە خۆی بدات بە شەق و قەمچی گەل بەرەو نارەزامەندییەوە ببات چونکە لە ئاکامدا دووچاری حاڵێکی دەکات خراپتر بێ لە هی کۆن، ئنجا لێشی دەبێتەوە فەرمانفەرمایەکی دڕتر لە کۆنە ئاغاکەی.

بیرکەرەوە و فەیلەسووف و خەباتگێڕ و سەرنجدەر و هەر کەسێکی هەبێ ئەگەر لە کۆمەڵایەتیدا نیگای خۆی بە هەموو پانایی و قوڵایی کۆمەڵدا نەگێڕێت نە بە تەواوی و نە نیوەچڵ تێی ناگات، هەمیشەکات بابەتی سەرنج لێ گرتن چەندین جار بەرفرەوانتر دەبێ لەو دەستوورانەی لێی وەردەگیرێن: چ لە کۆمەڵایەتی بێت چ لە قانوون و چ لە سروشت، دەستوورێکت نییە بەسەر هەموو بنەماکەیدا بکشێت ئنجا ئەگەر بابای دەستورساز توانیبێتی لە گۆمی پڕ مەعلوماتی مێشکی خۆیەوە جۆگەلەی دەستوورەکەی کێشابێت، کەسانێکی دوای ئەو دێن و چاو بە عەینی دەستوورەکەدا دەگێڕن لە باشترین حاڵدا تەنها لە دەقی دەستوورەکە شارەزا دەبن، ڕەنگە بە تەواو لە ڕاگەیاندنەکانیشی نەگەن چ جایێ ئەوەی بچینەوە بۆ ئەو هەموو چکۆڵە خڕ و شێو و جۆگە و میزاوانەی گۆمەکەیان پڕکردوە. ڕەنگە خاوەنی دەستوورەکە بە پشتیوانی ئەو گۆمە پڕە لە تەتبیقدا هەڵە نەکات وەیا دڵگەرمی و لایەنگیری بەلاوە بنێت، بەڵام بابایەکی لاوەکی، بێ گۆمی پڕ، خۆی لە شی کردنەوە و بەکارهێنانی دەستوورەکە هەڵقورتێنێ لێی دەوەشێتەوە بیکات بە

پەتی خنکاندنی ئەو کۆمەڵگەیەی کە دەستوورەکە خزمەتی ئەوانی مەبەست بووە چونکە هیچ گرێ بەندێکی دەستوورەکە بێ شارەزایی لە دەستوورسازی و لەو واقیعەی تێیدا بەکار دێت و ئەو ئامانجەی لێی چاوەڕوان دەکرێ، لە تەتبیقدا ڕاست دەرناچێ.

نەزەرەیە بۆ خۆی هەرچی دەفەرموێ با بفەرموێ، پلەی گۆڕان و هۆی بەرهەمهێنان و ئامانجی کۆمەڵایەتی و دەقی دروشمەکانی خەبات و داخوازی واقیعیش هەرچی دەبێ با ببێ، کە هاتینە مەیدانی چالاکی و حموجوڵی هەڵسووڕ و داسووڕی شۆڕشگێڕی لەوانەیە شتێک ببینیت بە خەیاڵتدا تێ نەپەڕیبێت وەک ئەوەی کە بەدوا ڕاپەڕینی «وثبە» دا لە شارێکی کورد نمایشتێکی توندوتیژ دەرچوو لە ژێر دروشمی «بمرێ دیکتاتۆریەتی عائیلی» هەر چونکە هەندێک لە باوکان کچەکانی خۆیانیان گێڕابۆوە لە نمایشتێکی ڕۆژی پێشووتر. هەر لەو دەمانەشدا بۆ خۆم شۆڕشگێڕم دیتوە بە ئافرەتانی شارەکەی دەگوت بێنن خشڵ و زێڕتان بفرۆشن و فابریقەی پێ بکڕن هەتا پرۆلیتاریا زیاد بکات کەچی هێشتا لەو شارەدا کارەبا نەبوو. ڕێگە و بانیشی وەک نەبوو بوو، نەشدەزانرا فابریقەی چی دابندرێ؟ کێ ئەندازیار بێ؟ چۆن لە دەرەوەی وڵاتەوە بهاوردرێ؟ چۆن؟

چەندوچۆنی پلەی گۆڕان و ڕاستیە کۆمەڵایەتییەکانی وڵاتێک لە واقیعی ئەو وڵاتەوە دەناسرێتەوە نەک لە هەلومەرجێکی فەلسەفە بۆی دانابێت. گریمان نەزەریە لە هەڵنانی دەقەکانی خۆی ئەو پەڕی ڕوونبینی و وردپێوی بەکارهێنابێ ئنجا سێ تێبینی زێدە بنجی هەڵدەگرێ:

1- ئیمکان نییە هێندەی واقیع قووڵ و بەرین بێ.
2- دەشێ هەڵەی تێدابێ وەیا مەبەستی تایبەتی بەچاوەوە گرتبێ.

3- دەشێ وردە دەمار و تیریژ و شیرازەی هەر یەکێک لەو کۆمەڵانەی گۆیا نەزەریەیان لەسەر هەڵستاوە بەر دەستوورە گشتیەکانی نەکەون، ئنجا لە تەتبیقدا لەجیاتی گەشە پێ کردن هەناسەی کۆمەڵ ببرێت.

دەشبێ بزانین دەستوور بۆ خۆی بریتیە لە قسەی قەتعی و دەقگرتووە، بە عادەت لەگەڵ بابەتی نەگۆڕاودا کە ئەویش دەقگرتووە دەگونجێ. هەتا بابەتەکەش مردووتر بێ پتر دەستووری لێ بەڕاست دەگەڕێ. هەرچی مێژوو و کۆمەڵایەتییە بەرهەمی زیندووترین و گۆڕاوترین بوونەوەری جیهانن کەوا هەرگیز وەک بابەتی کیمیا و فیزیا و فەلەک ناچێتە ژێر دەقی نەزەریەوە. هەر چونکە وەک ماددەی مردوو بێ هۆشیش نییە، وەک ماددەی مردوو بێ هۆش بێ ژوورخانیش نییە. کۆمەڵگە بەوەدا ناناسرێتەوە بگوترێ فیۆداڵە وەیا بۆرجوا وەیا سۆشیالیستە: کە ویستت کۆمەڵگەیەکی وەها دروست بکەیت کە بڕیاری دەورەبەرەکەی بەسەردا تەتبیق بکەیت و ڕاست دەرچێت، بێنە ئیرادە لە تاکەکانی بستێنەوەو بیانکە بە «شت» . دەشێ نەهێشتنی ئیرادەیان زۆر لە پێشبینەکانت لەگەڵ کردەوەیان جووت بڕوات. هەر بۆیەیە کە گوتمان کورد لە ڕێژیمی فیۆداڵدا ژیاوە ڕاستەوخۆ نابێتە ئینگلیزی فیۆداڵ چونکە میللەتی کورد بە هەموو مێژوو و کۆمەڵایەتی ماددی و مەعنەوەییەوە جودایە لە ئینگلیز. دەمێنێتەوە هاوچوونی ئاو و خاک و مڵکایەتیی زەوی لە کوردستان و لە ئینگلیزستاندا کە ئەگەر بشسەلمێنین وەکوو یەکدین [دیارە نە ئاو و هەوا و نە دەستووراتی مڵکایەتی و میرات لە نێوان کورد و ئینگلیزدا هاوچوون نین] بایی دەیەکی ئەو هۆیە ڕاستەقینانەش ناکات کە ژوورخانی لەسەر هەڵدەستێ. نۆ بەشەی دیکە، کە دەکات نۆبەشی ژێرخان، بریتیە لە ئادەمیزادەکە خۆی بە بوونی ماددی و مەعنەوییەوە. تەنانەت جۆری مڵکایەتی و بە میرات چوونیشی هەر دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤەکە نەک بۆ دار و بەرد و زەوی و ئاو و ئاژەڵ، چونکە ئەو شتانە دەستوور دانانێن. بە پێچەوانە دەستووریان لە مرۆڤەوە بەسەردا دێت ئیتر چاک بێت یاخراپ.

تۆ سەیری، لە کوردستان، بێ تێخوێندنەوەی ئینگلیزستان، چۆنیەتی ملّکایەتی و دابەش کردنی بەند بووە بەو ئایینەی کە کوردستاننشینەکە باوەڕی پێی هەبووە: دوور مەبینە جۆری دۆشاوگوشین و مێوژڕاخستن لە مسلّمانێکەوە بۆ دراوسێ گاورەکەی بگۆڕێ هەروەک جۆری حەیوان سەربڕین دەگۆڕێ... چێشت لێنان دەگۆڕێ... مارەیی دەگۆڕێ... فەرمانی کۆمەلّایەتی دەگۆڕێ... سەگ و بەراز دەگۆڕێ... چاک و بەد، پاک و پیس دەگۆڕێ... بەلّام هەر چونکە پۆشاک و نوێن و پێلّاو شتی ماددین و سەرناکێشنەوە سەر عەقیدە (کە ژوورخانە) دەشێ هاوچوون بن، خۆ ئەوساش ئەگەر لە کەلێنێکەوە تیشکی عەقیدەیان بۆ هات بایی پێداویستی عەقیدە دەبێ بگۆڕێن وەک ئەوەی لە ئیسلامەتیدا ناشێ پۆشاکی ئافرەت لە ڕوو، دەست و پێی بەولاوە دیار بخات. دەبێ قۆلّی جلک بایی هەلّکێشانی بۆ دەسنوێژ فەڕاح بێ.
مەبەست لەم نموونانە ئەوەیە، چۆن ژوورخان کە زنەی مێشک و دەروونی مرۆڤە زالّ دەبێ بەسەر ژێرخان وەیا بنەمای ماددی تا ئەوەی دەبینین خۆراکێک کە بژێوە بە تەواوی حەرام دەبێ (وەک گۆشتی بەراز و شەراب) وەیا هەلّئەنگاوتنی دەمی تیغ بایی یەک ئینج لە شوێنی تایبەتی گەردنی ئاژەلّ گۆشتەکەی لە ئیسلام حەرام دەکات، خۆ ئایین بەچکەی ئیلهام و غەیب و ئاسمانە کە دەکاتەوە دژمنی بابەکوشتەی مادده و ئیلحاد.

ئێمە ئەگەر لەبەر خاتری فەلسەفان چاو لە ڕاستیان نەنووقێنین بە ئاسانی، بەلّکوو بەناچاری و حەتمی، دەزانین «ژێرخان» ی مێژوو و کۆمەلّایەتی بە هەموو سەروبەرێکی ماددی و ناماددییەوە بریتییە لە «مرۆڤ» خۆی، بە خۆی و هەموو خاسیەتەکانیەوە کە لە غەریزەی گیانەوەرەوە دەگرێتەوە هەتا پاک سروشتی خۆبەخت کەران و گیانی ورشە (فیض)ی ڕووناک بینان و ڕاستی پەرستی زانایان. ئنجا ئەم مرۆڤە بەم خاسیەتە لە یەکدی نەکردوانەوە تێکەلّ بە کێشەی «پەلەی ژیان» دەبێ لەگەلّ بوونەوەردا، ئەویش بە سروشت و کۆمەلّایەتییەوە... بە هێزەکانی هاندەر و پاشخەریەوە. بە دیمەنە مەفهووم و چاو غەلّەتێنەکانیەوە... خولاسە بەمادده و مەعنا و ئاشکرا و

بزرەوە کە هەر یەکەیان دەیان و سەدان و هەزاران ڕێچکۆڵەیان لێ دەبێتەوەو تێکدەکەنەوە وەیا تێک ناکەنەوە و پشت لە یەکدی دەکەن، کەسیش ناتوانێ، مەگەر نیدای لە عاسمانەوە بۆ هاتبێ، بزانێ ئاکامی مامڵەت کردنەی مرۆڤ لەگەڵ خۆی و کۆمەڵایەتی و لەگەڵ سروشتدا چ نەوعە لەنگەرێک دەبەستێ و چ جۆرە ژوورخانێک دەزێ و چۆن شەو و ڕۆژان بەسەر دەبات چی لێ دەکەویتەوە، بەڵام لە شێوەی «نسبی» دا دەشێ وردە بڕیاری ڕاستی تێدا بدرێ:

وڵاتی سارد جلی گەرمی تێدا لەبەر دەکرێ... خواردنی چەوری تێدا خۆشتر دەبێ. ئاگری تێدا پتر دەکرێتەوە، کە ئەمانە هەمووی لایەنی (آلی) مامڵەت کردنە لەگەڵ دەوروبەردا. کە بچیتەوە بەلای ژوورخاندا هیچ ڕاستیەک لەو ساردییەوە وەرناگیریت: نازانیت چ دەربەستن. چۆن تۆڵە دەستێیننەوە. چەند غەریب نەوازن. لەگەڵ ئافرەتدا چۆن ڕێ دەکەن. چەندیەکی بەرهەمی درەخت و ئاش بەخاوەند دەدرێ. سزای ژن هەڵگرتن چییە. نرخی سەگ چەندە. نازانیت و نازانیت...

ئاواییەکانی ڕۆخ دەریا ڕاوەماسی دەکەن... ئەگەر هەبێ، لوولوو دەردەهێنن... ئەمەش مامڵەتێکی ئالی ئەوتۆیە بەهیچ سەروبەرێکی ئەو کۆمەڵگانەت شارەزا ناکات تا ئەگەر لە بەندەری «بۆمبا» ی هیندەوە بۆ بەندەری «بێروت» ی لوبنان سەفەرت کرد هەرچی لە یەکەمیانەوە فێربوویت بەکەڵکی سەردانی دووەمیانت نایەت.

- بیابانیشینەکان خێوەت نشینن، بەدوا ئاژەڵدا دەگەڕێن... ژیانیان سەختە. ئەمانەش دیاردەی ئالی و بێ ڕاگەیاندنی بیابانیشینیە: ژوورخانی عەرەبستان و تورکمانستان و بیابانی «کەلەهاری» ی ئەفریقا هێندەی وشک و تەڕ، سارد و گەرم لەیەکدی جودان. بە هەموو سەحراکانی جیهان بایی هەزاریەکی سەحرای نەجد شیعری بە کێش و قافیەیان نەداوەتەوە، هەرچی

نموونەیەک لەم جیهانە بهێنیتەوە بۆ بەراورد کردن لە نێوانیاندا هاوچوونیەکی بێبایەخی بنەمای ماددییان تێدا دەدیترێ و بەس، لەوەبەولاوە جوداوازی سەرلەبەر و سەرانسەرای ژوورخانیان دەست پێ دەکا. بەر لەوەی لایەنی کۆمەڵایەتی مرۆڤ بە هەموو حازر و ڕابردوو و پاشخانی سەقافی و نەریت و باوەڕ و کێشانەی چاکە و خراپە و جوانی و دزێوییەوە بزانیت ناتوانیت سەرەدەری لە ئیحتیمالی چونیەتی ژوورخانەکەی بکەین، ئەوساش پێکانی نوختەی ناوەڕاستی جغزی نیشانە برای موستەحیلە. ئنجا کە مامۆستا ئەمیر، بەلایەوە، ئەدەب و هونەری فرەنسەی فیۆداڵ نزیکترە لە ئەدەب و هونەری ژاپۆنی فیۆدال تا ئەدەب و هونەری فرەنسای سەرمایەدار، شتێکی گوتوە بایی ئەوەی لەگەڵ بۆچوونی ماددی تەقلیدیدا جووت ڕۆیشتوە، لەو واقیعەی دەیناسین بەرەواژ بۆتەوە. قسەکەی مامۆستا ئەمیر ئەدەب و هونەری بە نموونە هێناوەتەوە، منیش بە زۆری هەر لەو نموونانەوە قسە هەڵدەستێنم هەرچەند ئەسلی ڕایەکە وەها دادەبڕێ کە زۆرینەی پێک هێنەرەکانی ژوورخان بەر ئەو بڕیارە بکەوێ.

جارێ لە پێشەوە دەبێ بڵێم دانەوەی ئەدەب و هونەر بە قۆناخی مێژوویی، لەویشەوە بە هۆی بەرهەم هێنان، ڕاستەوخۆ و بێ تەئویل دەبێتەوە «قتووپەست» کردنی ئەدەب و هونەر هەروەک دەبێتە «قتووپەست» کردنی سەرلەبەری کۆمەڵایەتی، چونکە ئەدەب و هونەر، بەتایبەتی هونەر لە ناخی مرۆڤەوە دەردێن و هەرنەبێ هێندەی ئاخاوتن زادەی ئەون، تەنانەت ئەگەر بگوترێ «وشە» تەعبیردانەوە لە مادە و واقیع و دەوروبەر، تێکبەستنی وشە و ڕستە لە شیعردا تا دەبێتە ئەو هەستە دەروونیەی کە عاتیفەی گوێگر دەبزێوێ لە بەهرەی ئەدەبەوە دەردەچێ نەک بەشێوەی ئاوێنەیی لە ڕێی وشەوە وێنەی دەورەبەر دەداتەوە. هەر بۆیەیە بەرهەمی ئەدیبی هێژا لە بەرهەمی کەسی دیکە ناکات، چونکە دەروونەکەی هی خۆیەتی نەک هی غەیر، ئنجا ئەگەر دەوروبەری مردووی کاوێژ بکردایەوە وەک هەیە بێ ئەوەی گرۆچکەکانی خوێنی خۆی تێکەڵ

بکات، دەبوو لەو کاوێژ کردنەوەیەدا نوسخەیەکی دووەمی کاوێژکەرێکی وەک خۆی بێت.

هونەرکار لە ئەدیبیش «زاتیتر» ە، چونکە کەرەستەی تەعبیری ئەو وشە نییە، کە دەزانین وشە بەخۆی و واتایەوە ملکی هەموانە و تۆماریش کراوە: هونەرکاری سەردەم بەزۆری لە فەرهەنگی «تجرید» شەبەنگی وڕێنە و خەون و خەیاڵی خۆی کە بە حاڵ خۆی تێی دەگا ڕەنگودەنگی کەس نەدیتووی کەس نەبیستوو بە قسە دەهێنێ. ئنجا کە هەست و نەستی نەفەسی وەها گشت قتووپەستی زەویداری و سەرمایەداری و هیچ نەداری بکرێ ئایا ئەو بەشە ژوورخانانەی کە هێندەی ئەدەب و هونەر لە زاتی مرۆڤ ڕۆنەچوون وەیا بەرهەمی هاریکاری دوو زات و بیست زات و هەزار زاتن دەبێ چۆن بخرێنە نێوان بەرداشەکانی هۆی بەرهەم و ڕێژیمی ئابووریەوە؟

لە دەروەی شیعر و هونەرەوە بە نموونە دەڵێم مارەبڕینی ئافرەتی کورد کە لە 1300 ساڵەوە بە پێی دەستووراتی شەرعی ئیسلام، بە زۆریش لەسەر مەزهەبی شافیعی دەکرێ چۆناوچۆنی بە پێداویستەکانی فیۆداڵ وەیا سەرمایەدار وەیا پلەی ئابووری هۆی بەرهەمهێنان دەدرێتەوە؟ سەیریش لەوەدایە کە ئێستا مارەبڕین لە مزگەوت تەواو دەبێ هەرچەند لە پێشەوە ئیزن نیکاحی لە دادگای شەرعییەوە بۆ دەردەچێ.... خەڵقەکە بڕی بە نیکاحی ڕەسمی ناشکێت، چونکە مارە و تەڵاق بە پێوەندیەکی سەر بە ئایین دەزانی و حەز ناکا دەسەڵاتی دنیایی تێکەڵ ببێ تەنانەت مارەیی بێ مەلا هەرگیز بە هەڕەشەی فیۆداڵیش نەسەلمێنراوە. لە 1300 ساڵەوە کورد بەرەو قیبلە «باسم الله» لە سەربڕین دەکات و تیغ بە شوێنێکی دیاریکراوی گەردەنی کوشتوودا دەهێنێت، ئەگەرنا بە مرداری دادەنێت...

هەر ئەو کوردە کە هێندەی دەربەستی مەرجەکانی مارەبڕین و سەربڕینە شایی ڕەشبەڵەک دەکات. چەندێکی بۆی بلوێ لە مەیدانی زایەند (جنس، sex) بێ وەیا لە مەیدانەکانی دیکەی دنیا بێت بە قیلەشەرعان وەیا بەبێ شەرعی پاتەوپات ئارەزۆیە نارەواکانی دابین دەکات. تۆ سەیری، ئەو دزەی کە بەرخی دزراوی لە دەست مردار دەبێتەوە لێی ناخوا، خۆ دزین حەرامترە لە گۆشتی مردار. ڕەنگە کۆمە نەکا لە دامرکاندنی حەزی نێرانەی، وەیا مێیانەی، بەڵام بە دوا ئەو حەزەدا نوێژی بێ دەسنوێژ وەیا بێ غوسل ناکات... قسەش لە زۆربەی خەڵقی لێرە بە پێشەوەی سەردەمی فیۆداڵە نەک تاکوو تەرا. ئا ئەم دیاردانە کە هەموویان ژوورخانی بە تێکەڵ و چاوبەستەکێن پتر لایەنی ماددیان تێدایە، کەمتر زەنەی نەفسن لە ئەدەب و هونەر بەو پێە دەبێ ڕوونتر و ئاشکراتر بکەونە بەر فەرمانی فیۆداڵیزم و کاپیتالیزم و هۆی بەرهەمهێنان و دەستوورە ئابوورەیەکان. چۆن؟ کوا؟ لە کوێوە؟

خوێنەری بەڕێز، کاکە ئەمیر!

بەر لەوەی بڕیار بدەی ژاپۆنی فیۆداڵ و کوردی فیۆداڵ لە یەکدی نزیکن باسەیری فۆلکلۆری کوردی بکەین و هەر بە فۆلکلۆری کوردی بگرین: هەرچی بەری بادینانە لاوک دەڵێن، لە بەری سۆران و دزەیاتی حەیران دەچڕن.... پتر داکشێیت قەتاروئەڵلاوەیسی... بەرەو هەورامان سیاچەمانە بەرەو کۆیە برۆ نیوەشەو و (دەماغمم وزنە..) هەمووشیان ئاخاوتنی سەربەخۆ و چەژ و دابڕینی جودایان هەی کە لە یەکدی ناکەن. خۆ ئەگەر سەیری بەرتەسکیی ئەو هەرێمەی ناوم هێنان، بکەیت سەیرت دێتەوە لەوەی کە چۆن لواوە فۆلکلۆرەکەی هێندە لە یەکدی جودا بێ، ئنجا هەزار سەیرت دێتەوە لەوەی کە بگوترێ بە پێی تەوژمی ڕێژیمی ئابووری و پلەی گۆڕان و هۆی بەرهەمهێنانە دەبێ هونەری کورد و ژاپۆن لەیەکدی بکەن هەر چونکە

هەردوویان فیۆداڵن وەیا سەرمایەدارن. عەجایب و سەد عەجایب هونەری سابلاغی فیۆداڵ لەهی ئامێدی فیۆداڵ ناکات بەڵام دەبێ هەردوو هونەری لەیەکدی نەکردووی سابڵاغ و ئامێدی هاوچوونی هونەری ژاپۆنی فیۆداڵ بن.

ئەرێ کاکە ئەمیر تەناقوزی لەوە سەیرترت بیستوە؟ تا ڕادەیەک «حەیران» بە درێژ کێشانی ڕاست هاوێژییە و ڕواڵەتێکی دەشتی دزەیاتی دەداتەوە و لە عەتابەی عەرەبی دەکات، بەڵام نە ڕاوێژی لە عەتابە دەکات و نە دەشتایش پێوەندی بە ڕێژیمی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە هەیە.

ئەدەب، هونەر، زانست، فەلسەفە و هەرچی بەرهەمی عەقڵی و عاتیفی مرۆڤ هەیە کە بە وشە وەیا کەرستەی سروشتکرد تەعبیری لێ دەدرێتەوە زادەی زاتی مرۆڤە کە مامڵەت لەگەڵ بوونەوەردا دەکات. بەپێی دەسەڵاتی زاتەکەش تەعبیرکە هەڵدەکشێ بۆ جوانی و ڕەنگینی و تەواوی. چونکە مرۆڤ بەرهەمی نووسراو و دیتراو و بیسراوی لە ئەدەب و هونەر و لکەکانی دیکەی زانیاریدا پشتاوپشت بە میرات بۆی سەرەلێژ دەبێتەوە، چەندی لە تەجرەبەی خۆی سوود وەردەگرێ هێندە و پتریش خۆراکی هۆشەکی و ویژدانی و هونەری و ئەدەبی و زانستی لەو پاشخانە سەقافیەی میللەتی خۆی و هی ئەو میللەتانەش کە تێیان دەگات دەبێتە بژێوی گیان و بەهرەی. ڕێژیمی سیاسی و ئابووری و باری گوزەران ئەگەر نەشگۆڕێن تروسکەی هۆش و ڕۆشنەی فکر و تیشکی زانست ئەدەب پێ بەپێ و پشتاو پشت گەشتر و تیژتر و ساماندارتر دەبێ.

تۆ سەیری، بابایەکی جووتیار چۆن ساڵەو ساڵ لە جووتیاریدا پسپۆڕتر دەبێ هەر چەند کەرستەی جووت و زەوی و باران هیچیان ناشگۆڕێن. تەنها فەرقێک هەبێ لێرەدا ئەوەیە مەهارەت لە جووتیاردا سنووری هەیە لێی تێپەڕ ناکات بەڵام کەڵەکە کردنی ئەدەب و زانست سنوور هەڵناگرێ: وەک سامانی ساماندار هەتا بیخەیتە سەری زیاد دەکات. بە نموونە سەیرێکی

سەقافەتی ئیسلام بکە کە لە دوو سەرچاوەی قورئان و ئاستەواری پێغەمبەرەوە هەڵقوولیوە، لە ماوەی 200 تا 300 ساڵدا چ دەریای «فقه، اصول، حدیث، تفسیر، کلام، زمان...» ی لێهەڵڕژا... چون لە تاکە مەیدانی وەرامدانەوەی فەلسەفەدا کە هیچ پەیوەندی بە گاسن و فیۆداڵ و تیجارەتی ئاوریشم و شەڕ و هەراوە نییە، ئەوەندەی نووسین لێکەوتەوە سەد جاران بایی غەرق کردنی ئەسڵە فەلسەفەکە بکات. ئنجا لە مەیدانی بەرژەوەندی گوزەرانیشدا پێبەپێی گۆڕانی باری ژیان و بەڕێوەچوونی پێداویستی گشتی چەندین مەزهەب و شەقامەڕێ و باریکەڕێ و فەتوای جۆراوجۆر لە پانایی و قووڵایی کۆمەڵایەتی بە هەموو باریکیەوە بوون بە پشکنەر و کنەکەر و لێدەرەوە و هەڵێنجەر، خۆ موسڵمانانیش لەو ڕۆژگارانە بەپێی لێکدانەوەی فەلسەفەی ماددی مێژوویی هەر لە پلەی فیۆداڵدا دەژیان. ئەو مەلایانەی خەریکی دۆزینەوەی حوکمی شەریعەتیش بوون لە سەدی یەکێکیشی مووچەخۆری حکوومەت نەبوو تا بگوترێ فەتواکانیان بۆ بەرژەوەندی حوکمڕانەکان بوون. باری ئابووری ڕامیاری کۆمەڵ هەرچییەک دەبێ با ببێ.

پێشکەوتنی ژوورخان ئەگەر بە کوتەک مەنع نەکرێ کارێکی ئاسایی و بەدیهیە: گریمان میللەتێک لە ماوەی هەزار ساڵدا فیۆداڵ بوو، هۆی بەرهەمیشی لەو ماوەیەدا نەگۆڕا، دیسانەوە ئەدەب و زانست و هونەری بۆی هەیە پێشبکەوێ چونکە هیچ یەکێک لەو ژوورخانانە بەرهەمی پێمەڕە و گاسن و ئاش و خەڕەک و تەڵە نییە تاکوو پێشکەوتنی بەند بێ بەوانەوە. ڕۆشنبیری بە تێکڕایی، چ لە فراژیبوونی ئاسایی حەتمی خۆیەوە بێت و چ تاوو تینی ڕۆشنبیری وڵاتی پێشکەوتووە بێت دەتوانێ هەر لە چارچێوەی ڕێژیمی فیۆداڵدا هێندە بگۆڕێت و بەرەو پێش ببێتەوە کە لە چەرخێکەوە بۆ چەرخێکی دواتر نەشێ بناسرێتەوە.

ئەو کەسەی وەها دادەنێ کە ڕۆشنبیری تیشکی هۆی بەرهەمهێنانە ئاگادار نییە لەوەی کە بە تەنیشت و ڕۆخی خەتە جووتی گاڕەش و دەولکەی

ناعورەوە لە ماوەی سێ سەدەی سەرەتای ئیسلامەتیدا ڕۆشنبیری هێندە گەشەی کرد و پەرەی سەند کە لە هەموو مەیدانێکی ئەوسادا ئەم پەڕو ئەو پەڕی گرتەوە، تا ئەگەر یەکێک بیەوێ لە کوێرە ڕێگایانەوە تیریژێکی سەر بە قەزاوقەدەر بگێڕێتەوە بۆ بێ دەسەڵاتی کەسبی فەلاحەت بەرانبەر کاریگەرەکانی بەد و پەسەندی سروشت، چەند تیریژی دیکە دەبینێ لە «قدریە» هەڵدەگەڕێنەوە تا سەر بە ئینکار کردنی قەزاوقەدەر دەگەیەنن و بەرەو ئیلحادیش دەبنەوە.

شیعر بکەیت بە ئاوێنەی واقیع هەموو شتێکی تێدا دەبینی هەر لە ئیمانەوە هەتا کفر... لە تەصەوفەوە تا شیعری بێپەردە... لەسەر کزەڵەییەوە هەتا یاخیبوون... بەڵام ڕەنگە گارەش و دەولکەی ناعووری تێدا نەبینی. لێرەدا کە ڕۆشنبیری ئەو ڕۆژگارە بەرانبەر فەلاحەت دادەنێم، بە شوێن بۆچوونەکەی مامۆستا ئەمیر دادێم کە بنەمای واقیعی فیۆداڵ لەو پێوەندیەی نێوان فەلاح و زەویداردا دەبینێت و دەیکات بە «ماهیە» و دواتریش هاوچوونی ئەدەبی میللەتان بە هاوقۆناخیان دەبەستێتەوە، کەچی دەبینین ئەدەبی تاکە میللەت خزم نییە بەو قۆناخەی تێیدا دەژی. هەڵبەت ناشێ بڵێین دەوری عەباسیەکان پلەی فیۆدالی تێپەڕاندبوو، چونکە ئەم ڕۆژهەڵاتە سەدانساڵیش دوای عەباسییەکان نەگەیشت بە پلەی سەرمایەداری، میللەتی ئەوتۆشی هەتا ئیمڕۆکەش پێ نەگیشتوە، خۆ لە کوردستانەکەی خۆماندا نەمبیستووە تاکە یەک بانک وەیا «صەڕافخانە» ی کوردی پەیدا بووبێت بەڵام دەوری کۆچەری هەرگیز لێی بەسەرنەچوو....

چ عەجایباتێکە وەها لە بیرکەرەوەی سەر بە ماددیەت و ئابووری دەکات کە بەلایەوە شیعر و ئەدەب و هونەر و زانست یەکەسەر لە هۆی بەرهەمهێنان و جۆری چەوساندنەوە بەربنەوە کەچی هەر بۆ خۆی لە بیتوێن و لاجانەوە کوڕی خۆی بۆ پاریس و لەندەن و مۆسکۆ دەنێرێ شەهادەی ئەدەب و زمان و یاسا و ئاتۆم و هونەر وەردەگرێ کە ئەگەر مەسەلەکە بدەینەوە بەهۆی

بەرهەمهێنان و فیۆداڵ ڕەنگە دوای 100 ساڵی دیکەش ئەو تەرزە بابەتانەی ڕۆشنبیری لە بیتوێن و لاجان هەناسە هەڵنەهێنن ئیتر بۆچی پێ دادەگرێ لەسەر بەندبوونی جۆری ئەدەب و هونەری هەر وڵاتە بەو هۆیەی
بەرهەمهێنان و ڕێژیمە ئابووریەی کە هەیەتی خۆ لەوەتەی چەند هەزار ساڵە میللەتان ڕۆشنبیرییان بەیەکدی داوە وەک کە لەندەن و مۆسکۆ دکتۆرا بە خوێندەواری هەڵەبجە و سەردەشت دەدەن؟

بۆچی بە دڵۆپ ڕێژی هۆی بەرهەمهێنانی شەق و پەقی وەک پێمەڕە و گاسن و تۆڕ و تەشی دەرمانی خوێندەواری و ئەدەب و زانست لە چاوی میللەتان دەکات؟ کێ دەتوانێ لەبەر تاریکایی داس و مشار و تەڵە و ئاش ببێتە مەلا و میرزا و هونەرکار؟ کوردێکی بەر لە هەزار ساڵ لە ڕێی کتێبی
حازربەدەستی یۆنان تەرجەمەی عەرەبی کرابێ شارەزای مەنتیقی ئەرستۆ و فەلسەفەی ئەفلاتۆن بێت و لە دواکەوتووترین دێی کوردستاندا ئەو زانستانە بە فەقێیان ڕابگەیەنێ چۆن بە خۆیی و زانستەکەیەوە دەبرێتەوە بۆ لای کۆلی دۆشاو و گێرەی گاڕەش و فاقەی چۆیلەکە و ئەو تەرزە سندان و
قوزەلقۆرتانەی کە ئەگەر «علامه الدهر» بۆ ماوەی یەک ساڵ پێوەیان خەریک بێ دەچێتەوە قەپێلکی کەڕەواری.

لەوەتەی مرۆڤ مرۆڤە لە ڕێی بەگژداچوونەوەی زیندانەکانی «هۆی
بەرهەم» توانیویەتی بەرەو پێش بچێت: ئەگەر زاناکان و ئەدیبەکان و هونەرکار و شایەر و گۆرانیبێژەکانیش وەکوو فەلاح و ڕەنجبەر ئیلهامی فیکر و هونەریان لە داس و گاسن وەرگرتبایە هەتا قافی قیامەت نە زانست دەبوو نە فەلسەفە نە هونەر و بەیت و لاوک.... نە دۆزینەوە و نە داهێنان و نە هیچ.

تۆ سەیری، هەر پێشکەوتنێک و گۆڕانێکی بەرەو چاکتریەوە لەو ئامێرە خوێڕوانەدا کرابێ مێشکێکی غەیری مێشکی فەلاح و شوان و گابەدەلەوان

کردوویەتی: هەرگێزاو هەرگیز داهێنەری تراکتۆر و ئاشی ئاگر و فڕۆک فەلاح و ئاشەوان و کاروانچی نەبوون... خەڕەک بە بلیمەتی خەڕەکرێسەوە نەبوو بە فابریقەی قوماش... کابانی ماڵ مەنجەڵە ڕەشی نەگۆڕی بە مەنجەڵی کارەبا، ئاگردانیشی نەگێڕا بە تەباخی غاز و کارەبا.

هەمیشە فیکری بەرەو ژوورتر لە ڕێکاری جووت و ئاش و ئاگردان و خەڕەک و تەپکە و چەکوچ زەفەری بردووە بە داهێنان و گۆڕین و بەرەو پێشچوون. مەرجی یەکەمی دۆزینەوە و داهێنان ڕەهابوونە لە کۆتی تەسلیم بوون بۆ «پلەی مێژوویی و هۆی بەرهەم» هەمیشەکاتیش ئەو ڕەهابوونەی لە ئیلهامی ئاسۆی یەکجار بەرزتر و فرەوانتر و گەشتر لە ئاسۆی ڕەش و تەسک و و تارێکی زیندانی پلەی مێژویی و هۆی بەرهەم، بگرە بە دوژمنایەتی ئەوانیش، ڕوویداوە. ئەدیب و هونەرکار هەر چونکە وەک فەلاح و ڕەزەوان بە درێژایی ژیانی سەری بەسەر خەتەجووت و بنە درەختدا نەگرتووە، بەوەشدا ڕێی بینیی ئاسمان و سروشت و چەشمەندازی لێ کوێر نەبۆتەوە، توانیویەتی بەرەو ئەدەب و هونەرەوە بڕوات، دەنا لەم ڕۆژگارەشدا داهێنەر و دۆزەرەوە ئەو کەسە نییە کە مامڵەتی ئالەتی و بێ فکر لەگەڵ دروستکراوە سەرسووڕێنەکاندا دەکات: لێخۆڕی ئۆتۆمۆبیل کە بەراورد بکرێ لەگەڵ داهێنەرەکەی وەک لێخوڕی ئێسترە لەچاو زانا ئەدیب و هونەرکاری سەردەمی خۆیدا. کەسانێکی وەک لێخوڕی تراکتۆر کە مامڵەتی ئالەتی لەگەڵ بەرهەمەکانی ڕۆژگاری خۆیاندا دەکەن لەوە تێناپەڕێنن کە بە ڕاهاتن و شارەزابوون ببنە کۆمپیوتەر لە کارەکانیاندا، وەیاخود با بڵێین وەک ئەو دامەزانانەیان لێ دێ کە ئۆینی هەرە پەنامەکی لە چەند بەردێکی سەر تەختەدامەکە ساز دەدات، بەڵام یەک هەنگاو بەرەو هیچ جۆرە مەهارەتێک وەیا ڕۆشناییەکی دەرەوەی دامەکە ناچێ.

جووتیارێک 50 ساڵ خەریکی سازدان و هەڵوەشاندنەوەی کاروباری جووت بێت هەر ئەوەندە «چۆنایەتی» کاروبارەکە بەرەو چاکتریەوە دەبات کە

نەختێک لە «چەندایەتی» ئەرک و مەسرەفی عەینی جووتەکە بگێڕێتەوە: لەماوەی 5000 ساڵدا جووتیاری گاڕەش نەیتوانی و نەیزانی بنەڕەتی هیچ یەکێک لە ئامێرەکانی جووت بگۆڕێ، تەنانەت گۆڕانی «گاسن» لە دارەوە بۆ ئاسن شارستانیەکی چاوکراوەتر لە فەلاح دایهێنا. ڕەزەوان بۆ ماوەی چەندین هەزار ساڵ لە کۆلی دۆشاودا شەپتکێی بەسەر کیسە بووزووی تریۆە دەکرد هەتا لە دەرەوەی جغزی ڕەزەوانی دۆشاو گوشیندا بابایەکی پیشەسازی لێزان ئامێری «گوشەر» ی دروست کرد. تیروکەوان بە دەستی شەڕکەر و ڕاوکەرەوە نەبوو بە تفەنگ و دەمانچە.

هیچ پێشکەوتنێک و بەرەو چاکتر بردنێکی هۆی بەرهەم لەسەر دەستی بەکارهێنەرەکانیان ڕووی نەدا بەڵکوو لە ڕێکارێکی گەلێک بەرەو ژوورتری ئەوانەوە سەرەدەری لێ کرا، ئیتر بۆچی دەبێ ئەدەب و هونەری مەحکومی ئەو ئامێرە خوێڕوانە بن. گاسنێک نەتوانێ لەلای خۆیەوە بەرەو پێشتر بێتەوە چۆن دەبێتە مامۆستای ئەرەستۆ و شافعی و نالی؟ خەرەک و ئەبوو نەواس؟ تەپکە و فیساغۆرس؟ تەشی و سەلاحوددین؟ ئاش و لۆگاریتم؟ ئەوەندەی سەردەهێنم و دەبەم بە خەیاڵ و بە وڕێنەش خۆم پێ ئیقناع ناکرێ زانست و ئەدەب و هونەر مارەبڕاوی پێستەڕێوی مزەی ئاش و لەوەڕگەی مەڕ و مازوو چنین بکەم...

ژوورخانی وەها گەش و ڕابەر و جوان و بە نرخ و بایەخ لە تێکڕای کۆمەڵایەتی و تێکەڵبوونی ڕابردوو و سەردەم و لە سەرجەمی تەجرەبەی ئەدیب و زانا و هونەرکارەوە پڕشنگ دەداتەوە و دەبێتە مەشخەڵی بەرهەنگاوی ئەو کۆمەڵانەی بەبەریانەوە هەیە هەنگاو بەرەو پێشەوە هەڵێنن: ئەگەر زانست و ئەدەب و هونەر و فەلسەفە ڕەنگدەرەوەی هۆی بەرهەمی وەک دەرزی و تەڵە و خەرەک و داس و درێشە بایە هەتا قافی قیامەت هێزی هەڵم و کارەبا و ئاتۆم لە هەناوی سروشتی مردوودا وەک زیندووی ناو زیندان دەمانەوە.

ڕەنگە لێرەدا ڕایەک دەرببڕم کە بەلای خوێنەری بە پەلەوە خۆی سەیر بنوێنێ بەڵام کە سەرەنجی وردی لێگرت ئەویش وەک منی دەبینێ کە ڕایەکەم بەلای بەدیهیەدا دەچێتەوە: لە مەیدانە بەرینەکەی «هۆی بەرهەم و بەرهەمهێن و بەرهەم» دا هەتا «هۆی بەرهەمهێنان» خوێڕوو پاشکەوتوو بێ خالقیەتی ئەو کەسەی لە کاریان دەهێنێ لە عەمەلیەتی بەرهەمهێناندا بەرچاوتر و بێگومان تر دەبێ. پێبەپێی تێهەڵکشانی بەرهەم و هۆی بەرهەم بەرەو زانست و تەکنیک خالقیەتەکە دەچێتەوە بۆ ئەو مامۆستایەی کەرستەکە و هۆیەکەی بەرهەم لە ڕێی زانستەوە دادەهێنێت و خۆی لە عەینی بەرهەمهێناندا بەشدار نابێ بەڵکوو کەسانێک کە هیچ پێوەندیان بە لایەنی تەکنیکی مەکینە و فابریقەوە نییە، بە ماسولکە و هێزی ماددی کە کارێکی ئالەتییە خەریکی بەرهەمهێنانێکی بێ خالقیەت دەبن.

بە نموونە ئەو کەسەی بە تەپکە ڕاو دەکات پتر بەرهمهێنی ڕاستینە و یەکسەرە لەو کەسەی بە تۆڕ ماسی دەگرێ چونکە تەپکەکە مەخلوقی ڕاوکەرەکەیە هەرچی تۆڕەکەیە لە دەرەوەی جغزی ڕاوەوە دروست دەکرێ. ڕاوکەری قاز و مراوی بە بەردەقانی بە بەرهەمهێنترە لەو کەسەی بە تفەنگ ڕاویان دەکات. کەسێک بە دەستەجۆنی لە سنۆڵدا گەنم بکاتە ئارد پێوەندی خالقیەتی بە ئاردەکەوە پتەوترە لەو کەسەی بە ئاشی ئاو دەیهاڕێ، ئاشەوانی ئاشی ئاویش لە وەستای ئاشی ئاگر خالقترە هەرچەندە بەرهەمەکەش یەک بە دە بێ.

بەرهەم هەتا بەرەو ئاڵۆزکانەوە بڕوات لە خالقیەتی شەخسی بەرهەمهێن دەدزێتەوە بۆ شەخسی داهێنەری تەکنیک زان، هەربۆیەشە فەلاح و سەپان و جووتیاری تەقلیدی لە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵدا پتر بەرهەمهێنی ڕاستەوخۆن لەو فەلاح و جووتیار و سەپانەی مەکینە بەکار دەهێنن، ئەمانەش لە کرێکاری فابریقە پتر پێوەندیان بە خەلقی بەرهەمەوە هەیە، کرێکارێکیش کە بەهێزی ماسولکەکانی قوڕ خۆش دەکا سەد جاران خالقترە لەو کرێکارەی کە

بەشەو نۆبەت لە فابریقەی کەرپووچی فەننی دەکێشێت. خولاسە لە هەر مەیدانێکی بەرهەمهێناندا باسی خالقیەت بکەین ئەم دیاردەیە خۆ ڕەپێش دەکا، ڕاستیەکی ئەوتۆشە دەشێ ببێتە هۆی هەڵێنجانی هەندێ ئاکامی گرنگ لەسەر جوملەی مەیدانە تێک بەستراوەکانی فیکر و ئابووری و کۆمەڵایەتییدا.

یەکێک لەو ئاکامانە ئەوەیە کە وەک بەدیهیە ئاشکرایە پێوەندی لە نێوان بەرهەمی سەرەتایی کشتوکاڵ و وردە کەسب و کار و پیشەسازی و لە نێوان زانست و ئەدەب و هونەردا لە پلەی «نەبوون» دایە چونکە ئەو بەرهەم و هۆیە دواکەتووانە کە ناتوانن لە ماوەی هەزاران ساڵدا خۆیان بەرەو پێش ببەن بەولاتەریقەوە ڕەنگ و دەنگی زانست و ئەدەب و هونەر ڕوون دەبێتەوە هەر چونکە ئەمانە لە بنەڕەتدا «بنەما و ژێرخان و ماهیە» ی ژوورخانی بەرزی زانست و هونەر و فەلسەفە نین بۆیە هەرچی ڕواڵەتی شلک و ڕەنگین و پێشکەوتوو و تێهەڵکشاوی کۆمەڵایەتی هەیە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێک هاوچوون نابن، تومەز ژێرخانی ئەو ژوورخانە بەرزانە بە بنەمای بەرهەم و پێوەندی فیۆداڵ و ئەو «ماهیە» دواکەوتووانەوە نەبەستراوەتەوە.

سەرچاوەی ژوورخانی بەرز، بەداهەتەن، لە ژێرخانی بەرزەوە هەڵدەقووڵێت. دیسانەوە بەداهەتەن لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێک جوداوازی تێدا دەکات چونکە «پێشکەوتن» لە تەجرەبە و لێکدانەوە و هەست کردن و بۆچوون و شێواز... و ... هتد..ی هەمەچەشنەی فرەبابەتی لە یەکدی نەکردووی بیندرێژەوە پەیدا دەبێ، ئیتر هیچ سەیر نییە بەرهەمی ئەو تەرزە پێشکەوتنە (کە بریتیە لە ژوورخان) لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی دیکە بگۆڕێن تا سنووری بەرەو بەرەواژوبوون و شت لە یەکدی کردن.

نووسینەکەی کاک ئەمیر، کە دەنگی فێرگەیەکی فیکری فەلسەفی مەعلووم دەداتەوە، ڕووبەڕووی مەتەڵێکی تەماوی نامەفهوومان دەکات کە دەیەوێت لێی بسلمێنین کە گۆیە بنەما و ماهیەتی وێکچوون دەزێت و ژوورخانی

لێکدی جودای لێ بەردەبێتەوە بەمەشدا، زۆر بەسەیری لە جیاتی پتەو کردنی یاسای «سببیە»ی ماددی هەرچی ماددیەت و پێوەندی ماددی و «سببی» هەیە لە نێوان ژێرخان و ژوورخاندا تێدەچێت و بنبوو دەبێت. نازانم چۆن مرۆڤی ماددی لە خۆی دەسەلمێنێ دڵ بەو بۆچوونە خۆش بکات کە بڵێ «1+1 » لە تورکستان دەکات «3» بەڵام هیندستان دەکات «15» . بێگومان «1+1» لە هەموو جیهاندا هەر دەکاتە «2» جا ئەگەر کردی «8» دیارە ماملەکە «1+7» وەیا «5+3» وەیا «10-2» وەیا «4×2» ... وەیا ... یە، پێشیناوێ بابدەینەوە سەر تەئویلان بۆ بەڕاست گێڕانی موعادەلەیەک کە ڕاست نییە بە تایبەتی کە ڕێی دۆزینەوەی موعادەلەی ڕاست بۆ چاوی بینەر ئاشکرابێ.

ئاکامێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە ژێرخانی دواکەوتوو هەر بە پێی یاساکەی «سببیە» دەبێ ژوورخانی سافیلکە و سەرەتایی و دواکەوتوو بداتەوە وەک ئەوەی کە لە نووسینێکی پلێخانۆڤدا خوێندوومەتەوە دەڵێ دەوری ئافرەتی کۆمەڵگەی aborigine - ئەسڵەدانیشتووی ئوسترالیا - لە شایی ئایینی دووبارە کردنەوەی ئەو بزووتنەوانەیە کەوا ڕۆژانە لە دەرکێشانی ڕەگی ڕووەک بۆ گوزەران دەیانکات، لێرە بە پێشەوە لە نووسینی دیکەمدا لە باوکم گێڕاومەتەوە کە دەیگوت شایی «سێپیی» کوردی لە پێمەڕەکارییەوە وەرگیراوە دواتریش خۆم بۆ ئەوە چووم کە ناوەکەی «سێ پێ یی» ش هەر لە پێمەڕەکارییەوە هاتووە، چونکە پێمەڕەکە و دوو پێی بابای پێمەڕەکەر دەبنە سێ پێ. بێگومان ئەم جۆرە ژوورخانانە تا ئەبەد لای خاوەنەکانیان وەک خۆیان دەمێننەوە: دەبێ هونەرکارێکی پێشکەوتوو بیر بکاتەوە لە بەرەوپێش بردنی شایی سێ پێیی تا ئەو پلەیەی کە شانۆی مۆسکۆ و لەندەن و ڕۆما بە تەماشاچییە بڵندنۆڕەکانیان نیشان بدەن. بینینی ئەو جۆرە هونەرە سەرەتاییانە لە لایەن دانیشتووی وڵاتی پێشکەوتووەوە کە دانسی ئەوتۆ دەبینێ گەیشتبێتە پلەی سیحر و ئەفسوون تەنها بۆ دابین کردنی «نوێزانی» یە نەک تێر کردنی حەزی هونەری هونەر و جوانی. مەیلی «نوێزانی— حب الاستطلاع»

یش لە مرۆڤدا بۆ هەموو شتێکی تازە دیتراو بەخەبەر دێت وەک ئەوەی مرۆڤ دێت و ئۆتۆمبیلە ڕۆزڕایزەکەی ڕادەگرێ بۆ تێوەڕامان لە ڕووتەیەکی بەسەر کورتانی شڕەوە سواری کووچەکەرێک بووە. لەگەڵ ئەمەشدا وەها دەبێ، بە ڕێکەوت، بنەمای هونەری سەرەتایی بنەمایەکی وروژێن و تێک هاویشتوو بێت وەک ئەوەی شایی لە بنەمای جەنگ وەیا ڕاو وەیا شەڕناخێوی و شتی ئەوتۆوە سەری هەڵدابێ کە ئەوسا هەڵپەڕکێکە بە ناچاری پلەی سافیلکەیی تێ دەپەڕێنێ.

ئاکامێکی دیکە دەکێشێتەوە بۆ پێداهاتنەوە بەو گوتانەی کەوا لە مەیدانی «بەرهەمی قەومی» دا پشکی فەلاح و کرێکار دەستنیشان دەکەن: زۆر بە سەیری، ئەو فەلاحەی کە بە ڕاستی خالقی بەرهەمیەتی هەر هێندەی کرێکاری فابریقە لە بەرهەمدا بە خالق دادەنرێ کەچی کرێکار بەسەر ئامێر و مەکینەیەکەوە ڕادەوەستێ کە ئەو نەک کرێکارەکە سازدەر و دروستکەری بەرهەمی پیشەسازیە. فەلاحی تەقلیدی بەخۆیی و داس و جووت و ڕەنجبەرەوە سەرلەبەری عەمەلیەتی بەرهەمهێنان بە ئەستۆیەوە دەگرێ هیچ مەکینەیەکی نییە کە ئەگەر خۆی وەنەوزی دا نەوت دەربهێنێ وەیا قوماش بچنێ. هەرچی کرێکاری سەنعەتە ڕەنگە لە پلەی سێیەم و چوارەمدا بەدوا داهێنەر و پسپۆڕ و ئەندازیاردا بەرهەمهێن بێت. لە ئاست فەلاحی تەقلیدیدا پسپۆڕ و زانا و تەکنیک زان نیین، فەلاحەکە بیخەنە پلەی دووەمەوە. ئنجا کە دەبینیت لیستە دەگرن بۆ ئەو بەرهەمانەی کرێکار لە جێگەیەکی وەک عیراقدا لە نەوت و دەرمان و مەکینە... و... دروستیان کردووە بە ڕواڵەت کرێکارەکە دە ئەوەندەی فەلاحەکە خاوەن هونەرە لەسەر جوملەی دەخلی قەومیمان. لەو تەرزە لیستەیەدا پشتی هەموو ئەو زانا و تەکنیکناس و ئەندازیار و پسپۆڕانەی نەفەسیان بە بەر سنعەتەکە هێناوە، دەبردرێتەوە بۆ چینی کرێکار، کەچی فەلاحی تەقلیدی ڕەنگە لێی بدزرێتەوە بۆ جەمعیەتی فەلاحان. چ دروست کردنی گەڕۆک بە کرێکار بدەیتەوە و چ دەرهێنانی کتێب لە خاوەنی بستێنیتەوە بۆ چاپەوان فەرقێک ناکات. ڕاستیەکەی، کرێکار

هەر هێندە خاوەنی دەرهێنانی نەوتی ژێر دەریایە کە چاپەوان خاوەنی زانست و ئەدەب و هونەری لە چاپدراوە.

هەڵبەت من لێرەدا نامەوێ مافی کرێکار و هونەرەکەیی و دەورەکەی کەم بکرێتەوە وەیا ژێر لێو بخرێ، من تەنها دەمەوێ لە هەڵەی فکر و لێکدانەوە بەدوور بین، چی دەشی نووسم لە گۆشەیەکی بەرتەسکی پێوەندی ژوورخان بە ژێرخانەوە بەرەو ئەو ئاکامە دەڕوات کە ئەگەر لە پێشەکی لێکدانەوەماندا ورد نەبین زۆر لە ڕاستی دوور دەکەوینەوە ئەگەرنا پرسیاری بەرهەمی کشتوکاڵی و سنعەتی و تەکنیکی و زانستی و هونەری و ئاسمانگەری و... و... دۆزینەوەی پشکی هەر تاقمە لەواندا باسێکی درێژەدارە، لایەنی «کۆنینە و سەردەم» یش لە نوختەنیگای دەوری بەرهەمهێن» تێیاندا کارێکی وردە چونکە لەو بەرهەمە سەرەتاییانەی وەک ڕاوەماسیەوە دەست پێدەکات کە هێزی ماسولکە بە تەنها تێیدا خالقە تا دەگاتە ئەو بەرهەمە تێهەڵکشیوانەی کە ماسولکە تێیاندا دەور نابینێ. سەیریش لەوەدایە کە حاڵ و باری ئەوتۆ هەیە زانستی ئەتۆم و ئاسمانیش نابنە ماهیەت و بنەمای ژوورخانی ئەدەب و هونەر.

ئاکامێکی یەکجار گرنگی دیکە ئەوەیە کە هاتین و زانیمان ئامێرە دواکەوتووە خوێڕوەکانی وەک گاسن و داس و پێمەڕە بە بەریانەوە نییە خۆیان پێش بێخن، لەوەش وەک بەدیهیە زاندرا کە ناتوانن ببنە ژێرخانی ئەدەب و زانست و هونەر، لێمان ڕوون دەبێ فیۆدالیزم لە کۆندا بە خۆیی و بەو کەرەستە خوێڕیلانەیەوە ڕێی نەبووە ئیلهامی شۆڕشگێڕی و نوێخوازی و گۆڕینی ئابووری و کۆمەڵایەتی بزێتەوە و بیکاتە دیاریەکی ناچاری مێژوویی بۆ چینی سەرمایەدار، واتە بیری شۆڕشگێڕ لە عەینی فیۆدالیزم و گاسن و داسەوە هەڵناستێتەوە چونکە ڕێژیمەکە و ئامێرەکانی هیچ فیکرێک نادەنەوە تاکە یەک هەنگاو بەولای تاریکستانی خەتە جووتەوە ڕوون بکاتەوە.

فیکری شۆڕشگێڕ پردێک نییە سەرێکی بە فیۆداڵەوە و سەری دیکەشی بە بۆرجوازیەتەوە گەیشتبێتەوە بەڵکوو سەری لای فیۆداڵی لە بۆشاییدایە. هەروەک دەرمانی مەلاریا لە دەرەوەی نەساغیەکە و بە دژی ئەو دروست دەکرێ هەروەهاش فیۆدالیزم لە ئاست پەیدابونی بیری شۆڕشگێڕدا نەزۆکێکی سەر لەبەرە و هیچ پێوەندیەکی «نەسەبی» لە نێوان فیۆدالیزم و کاپیتالیزمدا پەیدا نییە هەروەک هیچ پێوەندی نەسەبی لە نێوان بەگژداچوونەوەی ڕووسیای داگیرکراو و لەشکرەکانی فاشیزمدا نەبوو.

کاپیتالیزم لە بنەمای «شارستانیەتی» سەری هەڵداوە. ئەوەی ڕاستی بێ دەبێ هەڵوەستێک بکرێ لە ئاست ئالقەکانی زنجیرەی قۆناخە مێژوویەکاندا (بەپێی بیری ماددی مێژوویی) تاکوو هەڵە نەکرێ لە دیارخستنی ڕادەی پێوەندی نەسەبی لە نێوانیاندا. بەدوا یەکدیدا هاتنی «ا، ب، ن، ک..» ڕاستەوخۆ ئیسپاتی ئەوە ناکات کە هەر دەبێ «ک» کوڕی «ن» بێ وەیا «ا» باوکی «ب» بێ، چونکە مەرج نییە وەک بەدوایەکدیدا هاتنی زستان و بەهار و هاوین بێ کە دەزانین، بەڕاستی، بەهار کوڕی زستان و باوکی هاوینە. هەر ئەم ڕاستییەیشە وەها دەکات سەپاندنی سۆشیالیزم بەسەر وڵاتی سەرمایەداری پێشکەوتوودا زەحمەتتر بێ لە سەپاندنی بەسەر وڵاتی فیۆداڵدا.

فیۆدالیزمی دواکەوتوو هیچ بەتەما نییە سەرمایەداریی لێ پەیدا ببێ چونکە پێوەندی نەسەبی پێیەوە نییە ئیتر خوای دەکرد لە جیاتی سەرمایەداری کۆمیونیزم دەهات بەڵام سەرمایەداریی پێشکەوتوو ڕەگی بە کۆمەڵایەتی و هەموو ڕواڵەت و ناوەڕۆکی میللەتەوە ئاڵاو و چەسپاوە: هەر لە دەمی ئێستاشیەوە شریتەی بۆ دوارۆژ درێژ کردۆتەوە. لەبەر ئەمە و لەبەر گەلێک هۆی دیکە کە پێی ناوێ لەسەریان بڕۆین، ناشتنی نەمامی سۆشیالیزم لە جێگەی بنەداری سەرمایەداری بە شێوەی داسەپاندن کارێکە تا بڵێی ئەستەم و بەسفتۆسۆیە. هەرچی سەرمایەداری پێشکەوتووە پتر حەز لە گۆڕانی هێمن دەکات، ئەو گۆڕانەی کە پێداویستی فراژی بوونی خۆیەتی، نەک لە لاوە بە

ملیدا دەبڕدرێت، تا دەبینین لە هەندێ وڵاتی پێشکەوتووی سەرمایەداردا جۆرێک سۆشیالیزم لە کاردایە زۆر بە درەنگەوە کۆمیونیزم پێی دەگات، ڕەنگە پێشی نەگات (سوید، سویسرە، دانیمارک).

یەکێک لە ئاکامەکانی دیکەی ئەوەیە، هەر چونکە هۆی بەرهەمهێنانی سەرەتایی هیچ تیشکێکی فکرو هۆش ناداتەوە، تا ڕادەی تۆقین سڵ لە بەرهەمی بەرەو پێش بوویەوەی زانست و تەکنیک دەکاتەوە. گاسن و داس و تەڵەیەکی نەیتوانی بێ بە درێژایی ئەزەل و ئەبەد یەک مێردزمە لە مێشکی فەلاحدا بکوژێ (بەپێچەوانە، مێردزمەی تێدا هەڵدێنێ) کە لە پڕ فڕۆکەی دیت حاڵ دەیگری و فەلاحەکە بەرەو ماڵی شێخ و ئاغاوە بەڕێ دەکات بەڵکوو لەوێدا چەپارە بدرێ لە کاری شەیتانی بە حەواوە.

ئامێری دواکەوتوو بەر لەوەی لە شتی نوێ بابەت بتۆقێ خۆی لە خۆیدا هێندە تەنبەڵ و تەنبەڵکەرە سێبەری نەفرینلێکراوی خۆی بەسەر دەروبەردا دەکێشێت و یاسا نەفرینلێکراوەکانی فەرمان بەسەر ئەو دەوروبەردا دەدەن. بە نموونە گاڕەش کە ئاژەڵێکی قوونگرانە حوکم بەسەر پەراوێزی سنووری «دێ» دا دەدات کە ئەوەندە دوور نەکەویتەوە. گاڕەش نەتوانێ سبەینان بگاتە زەویەکانی، ئێوارانیش دەبێ زوو دەست لە جووت هەڵگیرێ تاکوو گاڕەش بتوانێ بە چاوی ڕووناک بگاتەوە ماڵێ. بێگومان گاڕەش و داس و گاسن لە ژیانی سەرەتاییدا دەتوانن خزمەتگوزار بن، بەڵام هەر کە دەوری مەکینە داهات ئەوان کەڵکیان لێ دەبڕێ. خۆ ئەگەر هاتبایە بە پێی ڕواڵەتی تیۆری ماددی تەقلیدی گۆڕانی هۆی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ لە خودی ئەو ئامێرە هیچوپووچانەوە سەری بە تراکتۆر گەیاندبایە دەبوو هەتا هەتایێ خەون بەو موعجیزەوە ببینن.

کۆمەڵگەی فەلاح کە سەروکاری گوزەرانی لەگەڵ سەرەتایترین هۆی بەرهەمە و تێکەڵ بوونی لەگەڵ سروشت و لەگەڵ ڕەوتی ژیاردا لە پلەی

هەرەبەروژێری کزی و بێ هێزیدایە دەق گرتنی بە قەپێلک و ناوەڕۆکی وجودی ماددی و مەعنەوی خۆیەوە لەچاو دانیشتووی شارستان دەچێتە پلەی «دەقاق گرتن» کە ئیتر ڕێی بیر کردنەوەی لە گۆڕینی ئاموور و گاسن لێ دەبەسترێ... بە خەیاڵیدا نایەت نەریت و داب و دەستوور بەرەو چاکتریەوە ببات... ناوێرێ دەستی ڕەفز لە جنۆکە و مێردزمە بوەشێنێ... پێی ناکرێ دڵ بگێڕێ بۆ یاخیگەری و لە ستەم هەڵگەڕانەوە.

ئەمانە هەمووی لە لایەک: بەند نەبوونی کەسبەکەی فەلاح بە بەرژەوەندی فەلاحەکەی دراوسێی بە جۆرێک لە جۆرەکانی دوورەپەرێزی و کنارگیری و گیانی تاکایەتی ڕادەهێنێت. دەیکات بەو تاکە جەزیرەیەی لە تاکە جەزیرەی تەنیشتیەوە دابڕابێت و بە وشکانیشەوە نەنووسابێت. پێوەندی فەلاح بە ئاسنگەری شارەوە کە لە ساڵدا دوو سێ جار ئیشی پێی دەبێ پترە لە پێوەندی نێوان خۆی و فەلاحە دراوسێکەی چونکە ناتوانێ سەر لە ئاسنگەر نەدات بەڵام هیچ بەرژەوەندیکی پەکی لەسەر فەلاحە دروایسێکەی نەکەوتووە، بە زۆریش لە دەمی دروێنەدا سەپانی دراوسێکەی داڵدە دەدات... بە دزییەوە گیسک و بەرخ لە پەرێزەکەی دەلەوەڕێنێ.

ئەم ناوەڕۆکە شەختەکردووە مردەڵەیەی بێ هەست و جووڵەی هاریکاری و هاوبەرژەوەندی نێوان فەلاحان سەرەڕای دەردی خۆ خەفە کردن هەر خۆیەتی فەلاح ڕام دەکات بۆ بەر فەرمانی دەسدرێژکەر لە ملْکدار و ئاغا و فیۆداڵ ئەگەرنا نەدەشیا ژمارەیەکی کەمی کۆمەڵ دوولنگانە بەسەر ملی بەشی هەرە زۆری کۆمەڵدا بهێنێت: ورەبەردان و تەسلیم بوونە وەها دەکات ئاپۆرەی خەلق هێندەی ڕانەمەڕ فەرمانبەری بەچکە ئاغا و بەگزادە بێ. هەرچی دەسدرێژکەرە بە پێچەوانەی فەلاح خەریکی کارێکە بریتیە لە جموجۆڵ و بێنەوبەر و لێخوڕین و نەڕاندن. بێگومان خامۆشبوونی هەزاران هەزار فەلاح بۆ ماوەی سەدان ساڵ لە فیزونازی زاڵمانەی نامەردانەی

ملّکداری ژمارەکەم دەردێکی دەروونی ناوەکی کەسبی فەلاحەتی دواکەوتووە پتر لەوەی زۆڵە هونەرێک بێ لە ملّکدارەوە فەلاحی پێ هێرِ و گێژ کرابێ.

ئیمکان نییە قۆناخی ملّکداری فیۆدالیزم دیاردەیەکی حەتمی مێژوویی بێ ئەگەر کەسبی فەلاحەت و گاجووت لێخورِین فەلاحەکە لە خشتە نەبات بۆ بەر فەرمایشی ستەمکار، چونکە لە حاڵەتی ورەبەردان و تەسلیم بوون و ملنان نەبێ قەپوقرِی لێ هەڵگەرِانەوە و بەدەمداهاتنەوە و دەست وەبەردان و کۆڵەمست وەشاندن و شمشێر هەڵکێشان، بە ناچاری، دێتە کایەوە. ئەگەر کەسبەکە بریتی نەبێ لە تەسلیم بوون هەر لە سەرەتاوە لایەنی پەیدابوونی فیۆداڵ لە کۆمەڵدا نەزۆک دەبوو چونکە هەزار فەلاحەکە و دە فیۆداڵەکە کورِی یەک خاک و ئاووهەوا و دەوروبەرن. ئەوەی جودایان دەکاتەوە جۆری خەریک بوونە کە جۆرێکیان، هەزار فەلاحەکە مەیلەو دەخەسێنێ جۆرەکەی دیکەشیان دە فیۆداڵەکە دەکاتە قەمچی وەشێن. تۆ سەیری چۆن بەچکە فەلاح کە دەبێتە نۆکەری ئاغا، وەک گورگ بەردەبێتە گیانی مەرِ، ئەویش بەپێی فەرمانێکی لە ئاغاوە بۆی دەربچێت بەردەبێتە گیانی هاومەسلەکەکانی، بەڵام هەر کە چەکی نۆکەرایەتی دانا و گەرِایەوە قەپێلکی جووتیاری مێشەکزە لە لووتی دەر ناکات.

نووسەرانی سەر بە ماددیەتی بیری شۆرِشگێرِ کە دێن لە مەسەلەی فەلاح و فیۆدال دەکۆڵنەوە، زۆر بەسەیری، ستەمی زۆردار و سەرزەڵەیی ستەملێکراو دەبەنەوە رِادەی «قەزاوقەدەر» کە لێتۆژینەوە و بەسەر کردنەوە و لێ پرسینەوە هەڵناگرێ: هیچ تاکێک لەو نووسەرانە نە هات لە خۆی بپرسێ ئەرێ بەرِاست بۆچی دەبێ برِیاری مێژوو لە بارەی زۆرینەی «فەلاح» و کەمتاکورتی «فیۆداڵ» ئەوە بێ «کەم» ـەکە هێزدار بێت و «زۆر» ەکەش بێ هێز؟ ئەگەر هۆیەکە بدرێتەوە بە کۆمەڵبوونی ملّک و دەسەڵات لای فیۆدال خۆ ئەمە دەبێتە گۆرِینی «ئاکام» بە «هۆ» چونکە دەبوو لە سەرەتاوە ئەو کەسەی لە دوارِۆژدا دەبێتە فیۆداڵ ئەویش وەک فەلاحی دیکە بێت لە

لایەن پێکەوە نانی مڵک و دەسەڵات، ئیتر بۆچی دەبێ لە نێوان هەزاران فەلاحدا ئەم ئیمتیازەی مڵکداری و هێز بە چەند کەسێک بدرێت؟ بۆ تەنها لەوان بسەلمێندرێ؟ ئنجا هەر دەمێنێتەوە وە بپرسرێ ئایا بۆچی دەشێ هەزاران فەلاح چاو بپۆشن لە عەمەلیەتی نارەوای ئەو غەسپ و زۆرییەی کە فیۆدالێکی تازە هەڵکەوتووی مامناوەنجی خەریکە خۆی پێ دەکاتە میری سەربڕ؟ کە بووش بە میری سەربڕ خۆ هەزاران فەلاح پشت بدەنە یەکدی و لێی هەڵگەڕێنەوە خاکی لە توورەکان دەکەن.

بە نیسبەت کوردیشەوە ڕێ نییە بگوترێ حکوومەتەکەی کە نوێنەری چینی زۆردارە پشتگیری لێ دەکات چونکە کورد حکوومەتی نەبووە، تەنانەت ئەگەر بۆ تەفسیری دەسەڵاتی فیۆدال هاناش بەرێتە بەر حکوومەت دیسانەوە پرسیارێکی زلی بەقەدەر هەموو مێژوو یەخەمان دەگرێت لەوەدا بۆ دەبێ سەد هەزار فەلاحی وڵاتێک نەتوانن حکوومەت دابنێن؟ بۆچی سەرلەنوێ دروست کردنی حکوومەت ئیمتیازی «کەمایەتی» بێ نەک زۆرینە؟ هۆی بەرهەمهێنان و قۆناخی مێژوویی و بەرژەوەندی چینایەتی چ جۆرە پلانێکیان گێڕاوە دژی سەرلەبەری میللەت تا لغاو بخەنە زارییەوە و سەرقەمچیش بدەنە دەست کەمایەتی؟ خۆ ئەگەر بشگوترێ هەزاران فەلاحەکە لەو سەردەمە کۆنانەدا ڕێیان نەبوو یەکدی ببینن و تێک بگەن دژی فیۆداڵ، ئەوسا بەم قسەیە «خەباتی چینایەتی» لە بنەڕەتەوە هەڵدەوەشێتەوە و لزووم بە ڕەخنەکەی کاک ئەمیر نامێنێ...

وەک دەبینیت سەر لەبەری دیمەنەکە لە کاری جادوو و ئەفسوونی ساحیر دەکات نەک بڕیاری مەنتیقێکی کە نووسینەکەی ئەمیر لە تیۆری ماددییەوە پێمانی ڕادەگەیەنێ. وابزانم سیحرەکە بەم جۆرەی خوارەوە شەرح دراوە بەتاڵ دەبێتەوە:

وەک گوتم لە کەسبی فەلاحەتدا جۆرێک بێ هەستی و سڕبوونی لایەنی هاریکاری هەیە ڕێ دەدا بە تێک کردنەوەی دوو ڕووداوی مەلعوون کە وێکڕا دەبنەوە لەعنەتی مێژوویی: یەکەمیان ئامادەیی کەسبی فەلاحەت بۆ فەرمانبەرداری، دووەمیان هەل وەرگرتنی ستەمدۆست لەو ئامادەبوونەدا بۆ خۆ بەسەردا سەپاندن. ئەگەر لە جێی کەسبی فەلاحەت کەسبی ڕاو بنەمای ئابووری کۆمەڵگە بێ زۆردار پەیدا نابێ چونکە ڕاوکەر بەند نییە بە زەوی و گاڕەش و گاسنەوە، بەسەر پێیانەوە وەک ڕێوی و کەروێشک شاخەو شاخ و دۆڵاو دۆڵ تێ دەقووچێنێ دەستی زۆردار و زۆرنەداری ناگاتێ. ئنجا ئەگەر سەرنجێکی حاڵ و باری ڕەزەوانی و باغەوانی بدەین دەبینین ئەویش هێندەی فەلاحەت ملکەچ نابێ بۆ زۆردار چونکە:

1- بەرهەمی درەخت چەندین ساڵ بەدوای ناشتنی نەمام دەوەخرێ و خزمەتی هەمیشەکاتی دەوێ.
2- بایی ئەرزی یەک بەرەجووت لە فەلاحەتدا کە یەک فەلاح پێوەی خەریک دەبێ، ئەگەر ببێتە ڕەز و باغ چەند باغەوانێکی دەوێ.
3- میوە بۆ خۆی خەلق تێر ناکا دەبێ بە دەغڵ بگۆڕدرێتەوە کە ئەمیش بۆ خۆی سەرێشەیەکە بە زۆرەملی و چاوسوور کردنەوە زەحمەتە بچێتە سەر.
4- بەسەر ڕاگەیشتنی میوە لە لایەن فیۆدالەوە چ میوە بەدارەوە بێ و چ لە مشتاغدا بێ و چ لە سەفەری ساغ کردنەوە و فرۆشتنی بێ لە زەحمەت زەحمەترە.
5- هەرچی ئەرک و مەسەرفێکی جووت و باربەر پەیدا کردن و ئاودان و خزمەت... هەیە دەچێتە ئەستۆی خاوەنەکەیەوە.

لەبەر ئەم هۆیانە لە وڵاتی شاخاوی خۆماندا بەشی هەرە زۆری ڕەز و باغ هی ڕەزەوانەکە و باغەوانەکە بووە و هێندەی فەلاحەت زۆرداری بەخۆیەوە

نەگرتووە. بێگومان کە حاڵی فەلاح لەچاو حاڵی باغەوان لەو پلە بەرەژێرەی بێچارەییدا بێ هەر بەجارێ لەچاو دانیشتووی شارستان قسەی لێوە ناکرێ. ئنجا کە ئەم سڕی و بردەبارییە لە کەسبی فەلاحەتدا بنەمای لغاو قبووڵ کردن بێ لە خۆوە دیارە بە درێژکێشانەوەی ڕۆژگار دەسەڵات و هێز و مڵک و پایەی قەمچیوەشێن پەرە دەستێنێ بێ ئەوەی لە لایەن فەلاحەوە ڕێی لێ کوێر بکرێتەوە.

کەسێک خۆی قەمچیوەشێن بێ دەتوانێ ڕێ لە قەمچیوەشێن ببەستێ. هەر بۆیەیشە سەدان ساڵ بەسەر وڵاتێکدا تێ دەپەڕێ بێ ئەوەی هەرای فەلاحانی تێدا ڕوودابێت. هەر چونکە سڕی و بێهەستیش لە فەلاحەتدا هەیە بزووتنەوەی نارەزامەندانەی فەلاح بەند دەبێ بە بەرەوپێش چوونی شارستانەکان بە خۆیان و ڕابەرە فکریەکانیانەوە بۆ ڕێکاری بیری نوێ و یاخی بوون. هەر ئەو سڕیەشە دەبێتە ماکی ڕێ نیشتنی ترسی زۆردار و پۆلیس لە فەلاح. خۆ ئەگەر پیاوی سەر بە ئایین دەسەڵاتدار بێ جووتە ترسی دین و دنیا بە بەریەوە هەیە فەلاح بهاوێژتە باری خەوی مەغناتیسییەوە.

ئەم قسانەم تەنها لە لایەنی سڕی و ملکەچیی کەسبی فەلاحەت دەدوێن و ناگەنە باسی ئیمکان نەبوونی پێکەوەنانی حکوومەت لە لایەن فەلاحەوە چونکە ئێرەکانە جێی ئەو باسە نییە، تەنها ئەوەندە دەڵێم کۆمەڵگەیەکی فەلاحی کە وا بە درێژایی هەزاران ساڵ بارێکی کۆمەڵایەتی وەها نەبووبێ تاکە یەک خوێندەوار پێ بگەیەنێ چۆن ئەو بازە بەرینە بەسەر واقیعدا دەهاوێ کە بەولای مومکینەوە بیگەیەنێتە ڕێکاری زۆر بەرزی دامەزراندنی حکوومەت؟ چۆن؟ کەی؟ ئەم تێبینیانە و هەرچی باری بێئەژماری دیکەش هەیە لەوانەی ژیانی دەشتودەر بەرەو داوەستان و خامۆشییەوە دەبەن تێکڕایان لەبەر سێبەری دیاردەی پەیدابوونی لووتە هەرەمی لەمەوبەر باسکراودا دەدرێتە پاڵ سڕی و بێهەستی فەلاحەت و تابلۆی قەمچی کاری تەواو دەکەن.

ڕەنگە بگوترێ ئەم تێبینیانە ئەگەر ڕاستیش بن دەخلیان نییە بەسەر کاکڵی پرسیاری نێوان فەلاح و فیۆداڵ کە ستەمکارییە، لە وەڵامی قسەی وەهادا کە خۆم لە جیاتی ڕەخنەگر بەرەنگاری خۆمی دەکەم دەڵێم:

1- لە لایەن ستەم و دادەوە:

a) لەوەتەی کۆمەڵایەتی پەیدابووە واتای داد و ستەمی لەگەڵ خۆیدا هێناوە کە ئەمیش دیاردەیەکە لەگەڵ هەموو مەلعوونیەتی خۆیدا، ئادەمیزاد لە گیانەوەران جودا دەکاتەوە، چونکە یەکدی خواردن و یەکدی لەناوبردنی جانەوەران کاری فەرمانی سروشتە بێ ئەوەی فکرەی داد و بەزەیی و ئاکار لەوەدا زابێتەوە مەگەر مرۆڤ مەسەلەکە لە جانەوەر بدزێتەوە بۆ بەر تیشکی داد و ستەم و کۆمەڵایەتی خۆی کە ئەویش کارێکی نەزۆک و بێ لزومیشە..

ستەم لە مێژووی مرۆڤدا وەک دڕندەیی لە جیهانی جانەوەر، گەلێک بەولای فکرەی «تناقض» ـەوە دەڕوات و لەویش وێرانکەرترە بە تایبەتی لە کۆمەڵایەتیدا، کە ئەگەر بەدکاریی نێو کۆمەڵایەتی بەند بوایە بە «تناقض» ـەوە بەشێکی زۆر لە دزێوی و دڕندەیی و وێرانکاری کە ڕووپەڕەکانی ڕۆژگاری مرۆڤیان پڕ کردۆتەوە لە بنەڕەتدا ڕوویان نەدەدا چونکە ئەو بەرژەوەندەیان تێدا نییە کە دوو لایەنی «تناقض» لەسەری بەشەڕ دێن.

b) هەرچەندە ستەم کەم بێ و زۆر بێ هەر ستەمە بەڵام فەرمانی بەیەکەوە ژیان و هەڵ کردن لەسەر ئەوە هاتووە کە ستەمی عادەتی دوور لە دڕندەیی خاڵەبەخش بکرێ چ لە پلەی فیۆدالیزم و بەرەو کۆنتر بێ چ لە پلەکانی دوای ئەوەوە بێ. بە نموونە دەڵێم ئەگەر لکە مێوی جیرانەکەت هاتبوە ئەو دیوی پەرژینی نێوانتان و ناوناوە

هێشوێکت لێ قرتان لێت بەدەنگ نایەن، کەچی دەست بردنت بۆ هێشووی ئەودیوی پەرژین ڕەنگە هەرات بۆ بنێتەوە. ئەم خاڵەبەخش کردنەش لەگەڵ دەسەڵاتداردا پتر بەکار دێ و جغزیشی فرەوانتر دەبێ تا ئەوەی ڕەنگە دەسدرێژ کردنی دەسەڵاتدار بۆ پچڕینی هێشوە ترێی درواسێکەی بۆی بە تەوازوع لە قەڵەم بدرێ. لەم گوتەیەشمدا خۆت بە شایەد دەگرم: ئایا ئەگەر وەزیرێک و کاتبێکی بچووکی دایەرەی نفووس قەڵەمە پارکەرەکەت عەیبدار بکەن بەسەر کامیاندا دەنەڕێنێت؟ فەلاحی بەر لە دوو هەزار و سێ هەزار ساڵ و ئەم ڕۆژگارەش لە باشترین و گەشەترین حاڵەتیدا نموونەیەکی هاوچوونی من و تۆیە و هەرگیز ناشێ ئەو بووختانە گەوەرەیەی وەپاڵ بدەیت کە گۆیا پتر لە من و تۆ گوێ نەدەری دەسەڵات و بێدەسەڵاتی دەستدرێژکەر بووە، بە پێچەوانە، دە ئەوەندەی من و تۆ خاترانەی دەسەڵاتداری تێ خوێندۆتەوە تا ئەوەی پەندی [مەرحەبای براگەورە شەرابە] بنێشتۆکەی زاری فەلاحی سەردەمی فیبۆداڵ بووە.

C) دەستنیشان کردنی داد و ستەم لە هەر کارێکدا بێت دەدرێتەوە بە کێشانە و پێوانەی ئەو ڕۆژگارە و ئەو شوێنەی تێدا ڕووی داوە. ئەم قسەیەش بەولای داد و ستەمەوە هەرچی سەر بە کۆمەڵایەتیە لە ئایین، ئاکار، نەریت، ڕامیاری، ئابووری،..هتد دەگرێتەوە. کەس ڕێی نییە ڕەفتاری سەلاحوددینی ئەیووبی و شەرەفخانی بەدلیسی بخاتە بەر نیگای ئەو ڕۆژگارە. خۆ ئەگەر ڕێش درا نازاندرێ بدرێتە بەر کام نیگا: ئایین؟ قەومایەتی؟ چینایەتی؟ مرۆڤایەتی؟ دیمۆکراسی؟ بیرۆکراسی؟ ئنجا خاوەن بیرانی هەر یەکێک لەو تاقمانە لەوانەن لەسەر پرسیارەکە ڕێک نەکەون، تۆ ئەگەر ڕێت دا دوێنێ بە چاویلکەی ئەمڕۆ سەیر بکرێ نازانیت چی بکەیت باشە بۆ بەر

چاویلکەی سبەینێ! دەبێ بسەلمێنین ئەو ڕەفتار و کرداری بەر لە 500 ساڵ خەڵقی لێ ڕازیبوون ڕەفتار و کرداری پەسەند بوون هەرچەند بەلای مرۆڤی ئەم سەردەمە بەدترین ناویش هەڵبگرن.

هەروەک ئێستاکە ڕێمان نییە گلەیی لە دانیشتوانی دێیەکانی نزیک عەقرە بکەین کە ڕازی نیین کچانیان مایۆ لەبەر بکەن هەروەها ناشێ لە سەلاحوددین تورە بین کە لە ئایینی لانەدا بۆ قەومایەتی وەیا سۆفی مرادێکی سەید سادق بەر لە 100 ساڵ شێخپەرست بوو وەیا فەلاحێکی کەندیناوەی بەر لە 300 ساڵ بە ڕەزامەندی مڵکانەی دابێتە مڵکدار. تۆ خۆت ئەگەر سەر بە لایەنێکی ڕامیاری بیت هیچ لە خۆت ناڕازی نابیت، ئەگەر ڕەخنەت لە کارە چەوتەکانی سەرۆکەکەت نەگرت لە زۆر باریشدا چاوپۆشینیت لەو کارە چەوتانە دەبەیتەوە بۆ زێدە دڵسۆزی و بەرژەوەندبینینت ئیتر بۆ دەبێ فەلاحێکی کەڕەواری بەر لە 2000 ساڵ نەسەلمێن و ناڕەزا و ڕەخنەگر بووبێت. گەلێک لە ڕابەرەکانی ئەم سەردەمە بۆ ماوەی دوورو درێژ لە لایەن سوختەکانیانەوە لێیان دەسەلمێندرێ چەوت و چوێر بڕۆن. بەڵام هەر ئەو سوختەیە نازی ڕابەری چەوت و چوێر دەکێشێ دەیەوێ لێی بسەلمێنین فەلاحی میدیایی بەگژ ئاغاکەیدا هاتۆتەوە.

d) هەروەک دۆزینەوەی باری داد و ستەم لە مێژوودا یارمەتیمان دەدات لەوەدا کە بە چاوی کراوە سەیری داد و ستەمی ئەم ڕۆژگارەمان بکەین، بەسەهوو چوونیشان لەو مەیدانە کۆنەدا دەمانباتەوە بۆ بەسەهووچوونی تازە بابەت (ئەگەر نەڵێم بەسەهووچوونی لەحەد بەدەر) چونکە دیارە مرۆڤ لە ئاست دزێویەکی ڕابردووی کەس نەیدیتوو هێمنتر و لەسەرخۆتر دەبێ.

ئنجا ئەگەر پێ داگرین لەسەر تاوانبار کردنی ئەو ڕابردووەی کە بەلای خەڵقی لێرە لە پێشەوە بێتاوان بووە، هەر بەجاری دەبێ دڵ و گوێی خۆمان دادەیەخێن لە بیستنی عوزر و بەڵگەی ئەو هەڵوەستانەی کە لەم سەردەمەدا لێی ڕازی نین خەڵقی دیکەش گوێ نادەنە عوزر و بەڵگەیەکی لەسەر ئێمە دەکاتەوە. هیچ نهێنی ئاشکرا ناکەم لەوەدا کە بڵێم تەجرەبەی خەباتگێڕانی بەرە جوداکانی کوردی ئەم ڕۆژگارە هەمیشە بەردەوام بووە لەسەر یەکدی تاوانبار کردن... لەسەر نەسەلماندنی عوزری ڕەوا... لەسەر پووشکە بەچاوی خەڵقەوە دیتن.

لە تێکڕای ئەم چەند تێبینیە و هی دیکەی وەک ئەوانیش کە ئەگەر بە دوویان بکەوین درێژ دەخایەنن، دەردەکەوێ بەشێکی زۆری ئەم ناڕەزامەندیەی کە بیرکەرەوەی ماددی لە فەلاحی کۆنەوە بەرانبەر مڵکداری تێپەڕیوی دەبینێ لە ڕاستیدا ناڕەزامەندی فەلسەفەکەی خۆیەتی بەرانبەر فکرەی مڵکداریە دەیکات بە دیاری بۆ مێژووی خەباتی چینایەتی.

2- لە لایەن بایەخی سازدانی خەباتی سەختی فەلاحی مێژوو دژی مڵکداری ڕۆژگارانی بەسەرچوو:

a) بایەخی سازدانی ئەو خەباتە لە نوختە نیگای چارەنووسی ئادەمیزادەوە:
بەلای باوەڕی منەوە جایەز نییە عاتیفە تێکەڵ بە واقیع بکرێ چ واقیعی کۆن بێت و چ هی سەردەم. دەبێ چی ڕاستە لە حازر و مێژوودا ئەوە بگوترێ، ئەویش هەر نەبێ لەبەر دوو هۆی زێدە گرنگ: هۆی یەکەم ئەوەیە ئەگەر ڕێ بە هەڵبەستن و دەسکاری درا دەچینە بارێک کە ساختەکاری وەها بتەنێتەوە لە هیچ مەیدانێکی

کۆمەڵایەتیدا ڕاست و درۆ لێک نەکرێتەوە، وەک دەشزانین ئاڵۆزی و تێک ئاڵقانی داوەکانی کۆمەڵایەتی زێدە قەوغای سەردەم بە حاڵ لە ڕۆشنایی ڕاستیدا سەرەدەریان لێ دەکرێ بێگومان لە نێو تاریکایی درۆدا هەر بەجارێ دەبنە گرێ پچکە. هۆی دووەم ئەوەیە کە چارەسە کردنی دەردەکانی کۆمەڵایەتی لەبەر تیشکی دەستکرد و درۆزندا وەک نامومکینی لێ بەسەردێت و دەچێتە باری تەداوی دەردی دەستکرد بە دەرمانی ساختە، ئەوەی ڕاستیش بێ فەلسەفەی سەر بە سیاسەت یەکجار پێویستی بە خۆپاراستن لە هەڵبەستن هەیە چونکە، وەک دەزانین، سیاسەت مامڵەتی بازاڕییە پتر لەوەی فکر و ئاکار بێ، هەرچی فەلسەفەیە لێی داوا دەکرێ خۆی بە ڕاستیەوە بلکێنێ، ئنجا کە فەلسەفە لەگەڵ سیاسەت یەکیان گرتەوە بەناچاری ئامانجەکانی سیاسەت دەبنەوە بە بنەمای لێکدانەوەی ئەو فەیلەسوفانەی پشتگیری لە سیاسەتەکە دەکەن ئیتر هەر نادروستیەکی سیاسەتەکە هەبێ دەپەڕێتەوە بۆ ناو فەلسەفەکە. بەدوا ئەمەدا ماوەتەوە بڵێن ئەگەر لەو فەیلەسوفانە بشسەلمێنین کە سازدانی فکری ئەوتۆ چونکە خزمەتی بەرژەوەندی ئێستاکە دەکات عوزری هەڵبەستنیان بە دەستەوە دەدات خۆ ڕابردوویەکی مردووی کۆن سەر قەبر نابێتەوە تاکوو داخوازی سازدان و گونجاندنی فکری لە فەیلەسووف بکات. ئێمە نابێ بچینە بارێکەوە کە هەڵوەستی ئێستاکەمان هێز لە مێژووی درۆزن و دەست کرد وەربگرێ: دەبێ هەمیشە ئەو ڕاستیە بە چاوی خۆمانەوە بگرین کە تاکە یەک درۆی بنجی لە فکر و فەلسەفەدا یەک شریتەی درێژ و یەک ڕشتەی بەرین لە درۆیان بەدوا خۆیدا دەهێنێ ئنجا کە فکرەکەش بوو بە بنەمای ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەبێ بۆ خاتری پاراستنی حورمەتی ئەو درۆیە دەوران دەوری دا درۆ بەندانێک ساز بدرێ تاکوو درۆیە بنجیکە بەڕاست بگیرێ . بەنموونە دەڵێم تۆ کە بە

زانستی حسابت سەلماند «2+2= 5» ڕێ نامێنێ بگوترێ «5» نیوەی «10» یە چونکە «2+2» ناکاتە نیوەی «10»، ناشکرێ بگوترێ دەکات «3+2» چونکە بە پێی «2+2=5» دەبێ «3+2» پتر بێ لە «5»، خۆ مەعلومە ناشکا «6»...

ئنجا کە هاتین ڕابردووی کز و لاوازی ئادەمیزدامان کردە بورکانێکی یاخیبوون و هەڵگەڕانە و شۆڕش دەبێ خەریکی فێڵێکی چەند لایی بین: فێڵی یەکەمیان ئەوەیە کە بە چاوبەستەکێ وەها بکەین ئەو شۆڕشانەی پێشتر ڕوویان نەداوە و ئەو سەرکەوتنانەی دەردەست نەکراون جێێگەیان لە قەناعەتی خەڵقدا بکرێتەوە تاکوو بزانن ڕوویان داوە و دەردەست کراون.

هەڵبەت لەم مەیدانەشدا پێویستە هەموو داخوازیەکانی شۆڕشی بەردەوام وەک شەڕی چینایەتی و نەبوونی هێمنایی و هەبوونی دوشمنایەتی ناوخۆیی و بگرە بەردە و بکوژە ببەستە لە مێژوودا ساز بدرێ چونکە بەوانەوە شۆڕش و خەباتی بەردەوام پشتاو پشت بۆمان شۆڕ دەبێتەوە...
فێڵی دووەم ئەوەیە کە دەبێ بچینەوە بۆ مێژووی کۆن و لەوێوە خەریکی قوت کردنەوەی ئەو ماکانە بین کە دواتر لە سەدەی نۆزدەمدا فەلسەفەی خەباتی چینایەتیان پێ ببێتە دۆزراوەیەکی حەتمی، ئەم بەستنەوەی مێژووی کۆنیش بە داخوازیەکانی ڕاستبوونی فەلسەفەی چینایەتی دەگاتە پلەیەک کە ڕۆژگار سەرەو بن دەکات بە جۆرێک هەر دەڵێی لە سەرەتاوە فەلسەفەکە داهات ئنجا ڕووداوە کۆنەکان بوون بە ڕاستگێڕی فەلسەفەکە.
من بۆ خۆم لە نووسینی نووسەری سەر بە چینایەتیم خوێندۆتەوە کە «مثنوی» ی جەلال الدینی ڕۆمی بیری مارکسایەتی تێدایە.

ئێستا لە بارێکداین دەبینین بیریارەکانی فەلسەفەی چینایەتی لە ئاوێنەی فەلسەفەکەیاندا وێنەی »محەمەد و مەسیح و ئەسکەندەر و خەتی هیرۆغلیفی مەنتقی ئەرستۆ» دەخوێننەوە هەر دەڵێی بە لایانەوە کەمایەتیە بۆ نەزەریەکەیان ئەگەر وەک قورئان لە «لوح المحفوظ» دا لە ئەزەلەوە نەنووسرابێ.

فێڵی سێیەم، کە ڕاستیەکەی، بەدوا چەندین فێڵی دیکەی گەورەدا دێت ئەوەیە کە دەبێ سەرلەنوێ بەڵگەی پێ سەلماندن ساز بدرێ بۆ ئەوەی کە هەرچی شۆڕش و بزێویەکی مێژوویی ڕووی دابێ تێکڕای پێشەکی بووە بۆ پاڵدانەوەی بێ ورتە و بێ ڕەخنە و بێ بزێویی جەماهیر لە ژێر سایەی ڕابەرانی دەوڵەتی پرۆلیتاریادا. فەلاکەتی گەورەش لەوەدایە کە هەرچی جۆرە نارەزامەندیەکی لە تاک و کۆمەڵی ئەو «بەهەشتە» سەر وەدەرنێ ڕاستەوخۆ دەکرێتە نارەزامەندی لە چارەنووسی پرۆلیتاریا و مافی گشتی و بڕیاری مێژوو و چونکە ئەو ڕابەرانە بە پێی ڕاستی و پاکی و تەواویەکی کە بۆ نەزەریەکەیانی دەسەپێنن، لە شێوەی «تحصیل حاصل» دا هەموو ورتەیەکی نارەزامەندی لە لایەن تاک و کۆمەڵەوە بە ناپەسەندی و ناپاکی و خیانەت دادەنێن.

ئەو حیکایەتە زۆر گوتراوەی «رەخنەو ڕەخنە لە خۆگرتن» لە سێبەری فەرمانی ئەوان ڕابەراندا بۆ هەموو خەڵقی خواروی ڕیزی دەسەڵاتداران دەبێتە «مافی ڕەخنە لە خۆگرتن» کەرتی یەکەمی مەبدەئەکە کە «رەخنە گرتن» ــە دەبێتەماڵی حەڵاڵی ڕابەرەکان و بەس. تۆ کە لە ڕیزی ڕابەران نەبووی ئازادیت لەوەدا هەموو عومرت ڕابوێرێ بە گوتنەوەی ڕاستبوونی بڕیار و هەڵوەستەکانی ئەو ڕابەرانە، دەشتوانی هەمیشەکات خۆت و کەسانی وەک خۆت

بێدەسەڵات بدەیتە بەر نووکە چەقۆی توانج و سەرکوت کردن هەتا دەگەیتە «قارەمانیەتی» لە خۆ شکاندنەوەدا بە تەواوی وەک ئەو «سۆفی» یە زلانەی لە «هتک النفس» دا تێهەڵدەکشن بەرەو پلەی «ورشه- اشراق» ... چی تازەش گوتم ئەلف و بێی ئەو بابەتەیە... ئنجا لەبەر تیشکی ئەو ڕاستیە ئاشکرایانەدا هەڵبەستنی شۆڕشی فەلاح دژی فیۆداڵی بەر لە سەدان و هەزاران ساڵ لە نوختە نیگای چارەنوس و بەرژوەندی ئادەمیزادەوە کارێکە بەرەواژ و ناپەسەند و دوور لە چاکەی تێکڕای خەڵق بە تایبەتی چینی چەوسێنراوە کە بە تەمایە بەدوای هەزاران ساڵی بێ دەسەڵاتی ناچارییدا بتوانێ بەدڵی خۆی بژی. کە دەشڵێم بەتایبەتی چینی چەوسێندراوە لەوەوە دێت کە بە هەمەحاڵ چێنێک لە ڕابەر و پێشەوا و قسەڕۆیشتوان هەر دەبن وەک دەسەڵاتداری کۆن بە دڵی خۆیان بژین، دەمێنێتەوە پەرۆش خواردن بۆ چینی ژێرەوە کە دەبێتە واریسی چینە ژێردەستەکانی مێژوویی.

b) بایەخی سازدانی ئەو خەباتە لە نوختە نیگای چارەنووسی کوردەوە. لە پێشەوە دوو تێبینی ڕوونکەرەوە هەیە دەبێ بگوترێن:

تێبینی یەکەم ئەوەیە کە سازدانی خەباتی سەختی فەلاح لە مێژوودا لە ناچاری دەکێشێتەوە بۆ سازدانی فیۆداڵ تاکوو ئەو خەباتە یەخەگیری بووبێت. قسەش لەگەڵ مێژووی کوردە کە بەلای منەوە ڕێی نەبووە «فیۆدال» پێکبهێنێ ئنجا ئەگەر لە مێژووی ئەو میللەتانەی فیۆداڵیان هەبووە خەباتی چینایەتی فەلاح ئەو سەخت و خەستە نەبووبێت کە نەزەریەی چینایەتیی سەردەم داوای دەکات دیارە لە ڕابردووی کورددا وەک «تحصیل حاصل» خەباتی فەلاح لە خۆوە دادەبەزێ بۆ ئەو ڕێکارە واقعیە زۆر بەهێزەی کە لە مێژووی فەلاحی کورددا دەیزانین و پاشماوەشمان دیت تا ساڵەکانی

دوای جەنگی دووەم. چەند خۆش دەبوو،

ئەو نووسەرانەی کە لەسەر ڕووی کاغەز فیۆداڵی کورد خەڵق دەکەن بیانتوانیبایە هەر لەسەر ڕووی کاغەز فیۆدالەکەیان بکردایە حکوومەت و دەوڵەت بۆ کوردی لێرە لە پێشەوە: بەوەشدا خەباتی قەومایەتیان لە کۆڵمان دەکردەوە و خەریکی ڕێکخستن و بەرەو پێش بردنی کۆمەڵایەتیمان دەبووین... نووسەرانی سەر بە چینایەتی با بیرێک لەو پێشنیازە بکەنەوە و قۆڵ و باسکی خەباتی بە دواکاتەوە لە مێژوی ڕابردوومان هەڵماڵن و دەوڵەتێکمان بۆ سازدەن....

تێبینی دووەم ئەوەیە کە خۆم لە جیاتی خوێنەر دەیهێنمە بەرچاو: کوردم جودا کردەوە لە تێکڕای ئادەمیزاد بەوەدا کە نەهاتم لەبەر تیشکی بایەخی هەڵبەستنی خەباتی چینایەتی و فەلاحی تێکڕای ئادەمیزاد سەیری چارەنوسی کورد بکەم، هەر دەڵێی لێرەدا کوردم «ئادەمیزاد بەدەر» کردووە. ڕاستیەکەی، کورد لە زەمینەی باسی فیۆداڵدا ناچێتە ڕیزی ئەو میللەتانەی فیۆداڵیان هەبووە لەو ڕێگەیشەوە گەیشتوونەتە مافی چارەنووسی نەتەوایەتی خۆیان.

بێگومان باسی کورد لەگەڵ ئەو میللەتانەش ناکرێ کە هێزی دەریاییان هەبووە چونکە کورد ئەو هێزەی نەبووە... لە باسی فرۆکەوانانیش باسی کورد ناکرێ... لەگەڵ ئەو میللەتانەش باس ناکرێ کە کۆلیژ و زانکۆیان هەبووە... کە سەرەک وەزیران و قۆنسولیان هەبووە... چونەتە قوتبەکان... فابریقەی دەرمانیان دروست کردووە... قسەش لێرەدا فیۆداڵ (دەرەبەگ)ـە نەک مڵکدار. ئەمە لە لایەن «بوون و نەبوون» ی ڕووتەوە کە چاو تێبڕینێکی بە پەلە لە ڕابردوومان بۆمانی دیار دەخات. کە بێینە سەر لایەنی سیاسی و

کۆمەڵایەتی و ئابووری لە پرسیارەکە لە ڕووی بوون و نەبوونی
بەرژەوەندی قەومی لە هەڵبەستنی ئەو فیۆداڵە لە دایک نەزاوەدا،
ڕچەی لێرە بەدواوەی ئەم نووسینە،

بە کورتی بایی ئەوەی ببێتە ڕاڤەی خاڵی ب- لێی دەدوێت:

ئەو میللەتانەی بە مافی نەتەوایەتیان گەیشتوون لە ڕووی تێوەڕامان لە ڕابردوویانەوە بە دوو بەشی سەرەکی دابەش دەکرێن: یەکیان ئەوانەن کە لەبەر تیشکی تیۆری قۆناخە مێژوویەکانی بیری مارکسدا نەک هەر مێژوو دەخوێننەوە، بگرە پەتاتەش دەچێنن و بووکەشوشەی منداڵانیش دروست دەکەن، بەناچاری و بە شێوەی حەتمی بوونی بانگی موسڵمانان و ناقوسی دیانان بە سەر و پۆتەراکی فیۆداڵی زا و نەزاودا دەدەن و مێژووی پێ دەئاخنن. وا دەزانم تەنیا سوودێکی لەوەدا هەبێ پتەو کردنی ئەو تیۆریەیە کە ڕیژێمی ئەو دەوڵەتانەی لەسەر هەڵستاوە، لەوە بەو لاوە هەڵنانی فیۆداڵێکی نەبوبێت بۆ ئەوەی بە دەمەتیغی نەزریە کوناش کوناش و سوژناژۆ بکرێ ڕەنج بەخەساریە و بەس. فیۆداڵێک لەعنەتبار بکە کە هەبووبێت و تاوانباریش بووبێت، لە هیچە قووتی مەکەوە بە خۆڕایش تاوانباری مەکە.

بە هەمە حاڵ ئەو وڵاتانەی بە مافی نەتەوەییان گەیشتوون لەو ڕەنج بە خەساریەدا شیرازەی دەوڵەتیان لێ هەڵناوەشێتەوە. گریمان ئەویش وەک جنۆکە دەر کردن لە کلێشەی شێتی وڵاتی خۆمان بێت کە باغەڵ برە شەعبەدەبازەکان بە زەبری قەمچی لە ژێر ناوی «سوژن، مەشکە ڕەق، قوڵە شین..» دەریان دەپەڕاندن و شێتیشی پێ چاک نەدەبۆوە، مەگەر بۆ ماوەی چەند سەعاتێک کە ترسی قامچی خامۆشی دەکرد بۆی بە چاکبوونەوە حساب دەکرا. بە ڕاستی ئەو وڵاتانە ئەو زەرەرە نابینن کە میللەتێکی بێ کیان

و سامان بە لاسایی کردنەوەی ئەوان پاڵەوانپفی لە هەڵنان و کوشتنەوەی فیۆداڵی نەزاو دەکات و خەباتی خۆی تێدا بە فیڕۆ دەدات.

دووەمیان ئەو میللەتانەن لە بەر تیشکی هیچ نەزەریەکی قەرارداده نە مێژوو و نە واقیع ناخوێننەوە، بیرکەرەوە و فەیلەسووف و مێژووناسەکانیشیان بایی فلسێک گوێ نادەنە بیروڕای سیاسیەکانیان ئەگەر قسەیان لە باسی سەر بە کۆمەڵایەتی و مێژوو و فەلسەفە... و... کرد، حکوومەتیشیان لەسەر بنەمای «عقیدە» هەڵنەستاوە تاکوو فەلسەفەیەکی ڕەسمی وەکوو مارکسیزم لێیان ببێتە ئینجیل. بە نموونە سەیری حاڵ و باری سویسرە و فیلەندە بکە و ببینە باسی فیۆداڵ و ئابووری و ئایین و حکوومەت و هەموو بوونەوەر لە لایەن نووسەرانیانەوە چۆن دەکرێ.

لەو تەرزە وڵاتانە بیروڕای هەمەچەشنە لە بارەی هەموو باسێکەوە، بگرە لە یاری فتبۆڵ هەتا دەگاتە کەشکەڵانی فەلەک، لەخوێی چێشت باوترە هەرچۆنێکیشی لێوە بدوێن تێدا خەسارەتمەند نین چونکە باسەکان بە قوربانی ئێستاکەیان دەکەن بەو واتایەی کە خۆیانی پێوە ڕوون دەکەنەوە نەک قوربانی لە حازرەوە بۆ ئەو باسانە پێشکەش دەکەن. ڕەنگە لە واقیعیش دوور نەکەوتبێتمەوە کە بڵێم چی ڕابردووی سەدان ساڵی دواییە لەو وڵاتانەدا وەها ڕوون و ئاشکرایە بە جۆرێک تۆمار کراوە لەوانەیە باسی وڵاتێکیان شایەدی ڕاستبوونی لە وڵاتێکی دراوسێی چنگ بکەوێ. نابێ فکریش بۆ ئەوە بچێ کە گۆیا بە پێی حوکمی ڕێژیمی سەرمایەداری لەو وڵاتانەدا گۆشەنیگای حکوومەتەکانیان کە نوێنەری سەرمایەن لە باسەکاندا جێگیر دەبێ چونکە فکر و فەلسەفە لەو وڵاتانەدا دابەش بووە بەسەر چەندین قوتابخانەدا هێندەش ئازادن لە بیروباوەڕ کە تەدەخولی حکوومەت بەلایانەوە وەهم و وڕێنەش دەرناچێ، عەیبێکی هەیانبێ ئەوەیە کە ئەو قوتابخانانە تا ڕادەی قاڵب پێوەگرتن پەنجە لە بیروڕا گیر دەکەن.

حسابی کورد لە هەڵبەستنی فیۆداڵ و فەلاح بەگژەوەنانی، بۆ لای هیچ کامێک لەو دوو نموونەیەی سەرەوە ناچێتەوە، چونکە نە کیانی هەیە خەسارەتی ڕەنج بە فیرۆدانی ئەو هەڵنان و هەڵبەستنەی لە مەیدانی دیکەدا پڕبکاتەوە، نە مێژووشی وەها ڕوونە دەمەتەقە لەسەر باسەکانی پەیدا نەبێ، نە قوتابخانەی ئازاد و هەمەچەشنەشی هەیە منافەسە لەسەر دۆزینەوەی ڕاستیە مێژوویەکان بکەن. هەموومان دەزانین لەوەتەی لە دوای جەنگی دووەمەوە فکری کورد بۆ باسەکانی سەر بە مێژوو و کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەلسەفە و هونەر کراوەتەوە، بەزۆری و لە ڕادەبەدەر بە زۆری، لە کولانەی مارکسیزمەوە سەیری ئەو مەیدانانەی کردووە و هەمووشی داوەتەوە بە بڕیاری «سیاسی» کە لە سەرۆکایەتیی کۆنە ئینتەرناشناڵەوە دەردەچوو، هەرچەند ئەم ئینتەرناشناڵە دەوریشی بەسەر چووبێ، لای مارکسیستی کورد هەر زیندوو بووە و هەمیشە ویستوویەتی خەباتی کورد گرێ بدات لە بەرژەوەندی ئومەمیەت هەرچەندە ڕۆژەک لە ڕۆژان لە ڕووی بەرژەوەندەوە کورد لە ئومەمیەتدا بە «ئوممەت» نەژمێرراوە و تێ نەخوێنراوەتەوە چونکە ڕابەرەکانی ئەو بزووتنەوەیە لە حساب کردنی کورد بە بەشێکی ئومەمیەت ڕووبەڕووی هەڵوەستی ئەوتۆ دەبوون لەگەڵ هێزەکانی دوژمن بە کورد کە بەلای ئەو ڕابەرانەوە سەریەشەی بێ لزومی بۆ دەنانەوە. خۆ کوردیش نە ئەو هێزە بوو دڵڕاگرتن هەڵبگری و نە تووڕەش دەبوو لە دڵ ڕانەگرتنی.

بە نموونە: ساڵێکیان کۆبوونەوەیەکی میللەتانی ئاسیا و ئەفریقیا لە قاهیرەدا بەسترا، بەپێی ئەوەی کە مامۆستا زەبیحی بۆی گێڕامەوە نوێنەرانی «میللەت» ی کوردیش خۆیانیان بۆ هەڵکوتا بەڵام چەندی کردیان نەیانتوانی لە دەرگەی بارەخانەی ئاهەنگەکە ئەودیو ببنەوە بە نامەی ئەوەی کە کورد حکوومەتی نییە. نوێنەرەکان چەندی گوتیان براکان، هاوڕێکان، ئەمە کۆبوونەوەی میللەتانە نەک حکوومەتان، دادی نەدان و دەرکران، تا ئێرە گاڵتە کردنێکی مزرۆکە بە «ماهیە»ی «میللەت بوون و ئاسیایی بون» لە هەست و زمانان گەڕا. بەڵام کە برا ڕەشەکانی ئەمریکا هاتن و وەک قارەمان

به چەپڵە ڕێزان پێشوازیان لێکرا گاڵتەکە سنووری مزرایی و ترشایی و تاڵایی تێپەڕاند، چونکە ئەو برا ڕەشانە هەر وەک حکوومەتیان نەبوو نە ئاسیایی بوون و نە ئەفریقایش... بەندوباوی «ماهیە، عرض، زێرخان، ژوورخان، فەلسەفە، حەقیقەت..» هەموویان جێگەیان چۆڵ کرد بۆ «ماهیە»ێک کە چ پێوەندی بە ئاسیا و ئەفریقا و مافی میللەتان و ئازادی و دادەوە نەبوو.
ئەوەیش بریتی بوو لەو بەرژەوەندەی، کە سەرۆکایەتی ئومەمیەت لە حازربوونی ڕەشەکانی ئەمریکای ڕەچاو دەکرد بۆ تاکە مەبەستی زڕاندنی ناوی ئەمریکا، (سەدجاران ڕووی سیاسەتەکەی ڕەش بێت).

لەو ڕووداوەدا کە کورد بیتاقەی «ماهیە»)ی میللەت بوون و ئاسیایی بوون و پێشکەش بە دەرگەوانی ئاهەنگەکە کرد هێندەی ئەسکیمۆی ئالاسکا دەست بەتاڵ مایەوە... کاشکی «عرض»ێکی زێدە بێبایەخی بەدەستەوە دەبوو پێی بچێتە ناو ئاهەنگەکە ئیتر خوای دەکرد هەرچی «عرض و ماهیە» ی دونیا هەیە تێکەڵ دەبوو.

هەڵبەستنی قەڵافەتی فیۆداڵ لە مێژووی کورددا بۆ ئەوەی خەباتی چینایەتی فەلاح بەرەنگاری بێت و بەمەشدا بەراتنامەی ڕاستبوونی تیۆری چینایەتی و «تناقض» قامکێکی کوردیشی لێ بدرێت لە واقیعی خەباتدا دەبێتە ئیمزا کردنی سەنەدی کۆمپیالەی قەرزداری، چونکە بە درێژایی هەموو ئەو ڕۆژگارانەی کە بەلای فەلسەفەی چینایەتیەوە دەستی پرۆلیتاریا بە دەسەڵاتی حوکم ناگات هەرای نێوان چینەکانی کورد دەبێتە درێژە کێشانێکی ئاسایی و بەدیهی و بێ دەمەتەقەی خەباتە مێژوویەکەی کە ئەرکی هەڵبەستنی بۆ کێشراوە، ئەوساش خەباتی قەومایەتی کە لە ڕاستیدا دەبێ پرۆلیتاریای کورد بەشی هەرە بنجیی بێت لە خۆوە دەپوکێتەوە و دەچێتەوە وجود و ئازادی و سەربەخۆیی خۆی دەدۆڕێنێت و لە باشترین و گەشترین حاڵەتیدا دەبێتە سێبەرێکی ساردوسڕی شەڕەچەپۆکی ناوخۆیی کە ئەویش هەر سێبەرێکی ساردوسڕی خەباتی ئومەمی دەبێ، چونکە بزووتنەوەی چینایەتی کورد

هەمیشەکات و بەوپەڕی دڵگەرمیەوە خۆی دەقەبەڵ ئومەمیەت کردووە و هەتا بۆی کرابێ بە ناوی پاراستنی یەکێتی خەباتی چینایەتی لەو وڵاتەی کوردی تێدا دەژی پرۆلیتاریای کوردی کردووە بە پاشکۆی پرۆلیتارای ئەو وڵاتە و هەموو جۆرە بزووتنەوەیەکی سەربەخۆی کوردی بە «انفصالیە» داناوە و بە کوتەکی ئیستعماری حساب کردووە.

وەها دەبێ باری ناچاری و بێدەسەڵاتی و لێقەوماوی تاکتیکی وەهای پێ بەکار دێنێ بتوانێ لە سایەیدا هەناسە هەڵێنێت، بەڵام تا ئەو ڕۆژەی دان بە سەربەخۆیی سەرلەبەری خەباتی کوردا دێنێت و پێش ئومەمیەتی دێخێتەوە تاکتیکی ئەو تۆیی وەک کە خۆیان دەڵێن «بەندیخانە ئیستەگەی حەسانەوەیە» ئەمیشیان هەر پشوودانی میوانە لای خانەخوێی سەر ڕێگەی قافڵە...

تۆ واز لە مێژووی دوور و بەسەرچووی بهێنە و سەیری ئەمڕۆژەی 1982/11/10 (کە ئەم دێرانەی تێدا دەنووسم) بکە چۆن جودا کردنەوەی «چینایەتی کورد» لە «قەومایەتی کورد» دوای وەرگەڕانی تەختی محەمەد ڕەزا پەهلەوی لە ئێران وەهای کرد کە یەخەگرتنی بێکات و بێجێ و بێلزووم و بێسوودی مڵکداری کورد لە لایەن چەپڕۆیانەوە مڵکدارەکانی کردە دیاری بۆ حکوومەتی تاران دژی بزووتنەوەی کوردایەتی لە ئێران. من دڵنیام لەوەدا چەپرۆیەکان دەیانزانی دەر کردنی مڵکداری کورد لە لایەن ئەوانەوە فەلاحەکە مڵکدار ناکات، ئەگەر دەستی حکوومەتی تاران نەبەستن و کوردستان ئازاد نەکەن، دەشیان زانی نە دەتوانن دەستی حکوومەتی تاران ببەستن و نە کوردستان ئازاد بکەن: ئەوان لە کولانەی فەلسەفەی چینایەتی و تیۆەڕامانی ئومەمیەتەوە دەجمین و دەجوڵان و حسابێکیان بۆ بەرژەوەندی ڕاستینەی فەلاحی کورد نەکردبوو هەر وەک لە کدولەی تەڕیشدا چ حسابێکیان بۆ بەرژەوەندی «کوردایەتی» بە دڵدا نەهاتبوو بە تەواوی وەک ئەو موسڵمانە ڕاست و دروستەی کە لە سبەینەی

زستانی شەختە کردوودا بە ئاوی بنبەستەڵەک دەستنوێژ دەشوات مەبەسێکی دونیایی، نە کورد و نە عەجەم، بە بەرچاوەوە ناگرێت و دڵی بۆ بەهەشتی دوای مردن بەرداوە... وەک بەهەشتی ئومەمیەتی چەپڕۆکە. دەشبێ لێرەدا دوو تێبینی بچووک ڕەچاو بکەین:

یەکەمیان ئەوەیە کە دەستنوێژەکە ئەگەر برک و قۆلنجیش بە نوێژکەرەکە بکات زەرەر لە کوردایەتی نادات و قازانجیش بە حکوومەتی تاران ناگەیەنێت. دووەمیان ئەوەیە کە بە هەشتی ئیماندار بەڵێنی دوای مەرگە، تەجرەبەی سیاسی و ئابووری و چینایەتی و قەومایەتی کە تێدەشکێن و ئاکامی بەرەواژ بە دەستەوە دەدەن ناتوانن بۆ نوێژکەر ببن بە بەڵگەی هەڵەبوونی ئیمانەکەی وەک بەڵگەی هەڵەبوونی ڕێبازە دونیایەکان بە دەستەوە دەدەن لێیان چاوەڕوان دەکرێت «ئەو ڕێبازانە» ڕێنماییەکی ئەهلی دونیا بکەن.

دوای لادانی محەمەد ڕەزا و گەڕانەوەی برا کوردە پەنابەرەکانی ئێران لە عیراقەوە بۆ کوردستانی ئێران نوێنەرێکیان سەری لێدایەنەوە... ئەو قسانەم لێ بیست کە لە دوای ڕاپەڕینەکەی 1948 «وثبە» چەپڕۆیەکانی کوردی عیراق باڵەفڕەی لەخۆباییبوون و بەسەهووچوون و چاوئەبڵەقبوون وشکە سەرخۆشییان پێوە دەکردن.

32 ساڵی ڕەبەق لە تەجرەبەی تاڵی تێشکان و ماڵ کاولی و ڕەنجبەخەساری و نابووت بوون، هەر لە 1948 ـەوە تاکوو 1980 چەپڕۆی کوردی لە واقیعی خۆیی و خەباتەکەی شارەزا نەکرد، چونکە لە پشت چاویلکەی فەلسەفەکەیەوە واقیعێکی ئەوتۆ دەبینێ پێوەندی بە کورد و مێژووی کورد و باری ماددی و مەعنەوی ئێستاکەی کوردەوە نییە، یەکسەر لە ئاوێنەی سازدراوی نەزەریەدا وێنەیەک دەبینێت وەک ئەوەیە لە چلەی زستاندا ترێ و هەنجیری گەیشتوو بە درختەوە ببینێت... هەر جارەش کە دەستی بۆ

دەبات لە جیاتی میوەیەکی کە وجودی نییە چقڵی لە پەنجەکان دەچێت بەڵام هەمیشە دڵی خۆی بەوە تەسکین دەکات کە ئیمپریالیزم و فیۆداڵ و بۆرژوا و کۆنەپەرستان تریێی لێ دەگۆڕن بە درۆ...

بەلای باوەڕی منیشەوە ڕۆژێکیان کە چەپڕۆکە بگاتە دەسەڵات بەر لەوەی مڵکدار بنەبڕ بکات کۆنە خەباتکەری بەرەی یەکگرتوو لەناو دەبات، چونکە ئەوانیش هەر بە پێی نەزەریەی سەر بە چینایەتی بەشێکن لە بەرهەڵستی پێش هەنگاوی پرۆلیتاریای کورد و کاروانی تێکڕای ئادەمیزاد بەڵام بەشێکی چالاک و خاوەن ناو و شۆرەت لە خەبات و شۆڕشدا کە ئیتر چاو لێپۆشین و لێ ڕاوەستانی خەتەرتر دەبێ و لەوەی مڵکدار و پارەدار بۆ ماوەیەک هەناسە هەڵێنن، بەڵگەی ئەم ڕاستیەش هەموو مێژووی خەباتی ئەم چەپڕۆیانەیە یەکێک لەو بەڵگە چاوپۆشینیانە لە مڵکدار و پارەدارەی بە دۆستی خۆیانی دەزانن.

لە هەڵبەستنی خەباتی چینایەتی فەلاحی کورد دژی مڵکداری کۆنینە لاپەڕەیەکی تازە هەڵدەدەمەوە..

بەپێی بۆچوونی ماددی مێژویی ئەو قۆناخانەی ئادەمیزادیان تێدا تێپەڕوە لە عەملیەتی گۆڕان و بەرەو پێشچووندا پەیدابوون نەک دەستێکی دەرەکی ناحەز وەیا هێزێکی غەیبی بە مل ئادەمیزادی دابڕیون، بەو پێیە ئەو قۆناخانە کە یەک لەوان فیۆداڵە بەچکەی حەتمی و شەرعی فراژیبوونی کۆمەڵایەتییە (من عەبدایەتی بە قۆناغ نازانم بۆیەیە بەلای منەوە بەچکەی شەرعی نییە، بیژۆکە). ئنجا ئەگەر ڕاست بێت فیۆداڵێکی کورد هەبووبێ (بەداخەوە نەیتوانی هەبێت) دەبێتە شتێکی ئاسایی و چاوەڕوان کراو، کە هەڵناگرێ بەدوا کاتەوە خەباتگێڕی کورد ڕقی خۆی لە شەبەنگە مردووەکەی هەڵستێنێت و خولیای خۆیی و خەڵقی دیکەشی پێیەوە خەریک بکات، تا ئەو ڕادەیی ببێتە

میردزمە و مۆتەکەی ئەفسانەپەرستان، کە هەمە کات لە پەردەی تەصەوریاندا دەزریکێنن و جلوەش دەبەستن.

نووسەرانی ماددی مێژوویی بۆخۆیان دەڵێن لەو سەردەمانەدا ئەگەر هەموو فیۆدالیشت لەناو بردبانایە سەر لەنوێ وەک گیای بەهار هی دیکە شین دەبوونەوە، تەنانەت گلەیش لەو ملّکدارە هەناو پاکانە دەکەن کە زەویەکانیان بۆ فەلاحی بێدەسەلات بەجێ دەهێڵن، چونکە، بەلایانەوە، زۆر نابات دەکەونە دەست ملّکداری تازەی بێ ڕەحم. ئنجا کە بەڵایەکی ڕۆژگار وەها حەتمی ناچاری بووبێت کە هیچ جۆرە بەدیلێکی نەبوبێت چ ڕەوای هۆش و ژیربێژییە دوای سەدان ساڵ بەسەر تێپەڕینیدا هەرچی هۆش و گۆشی گەنجی خوێن گەرم هەیە تێی بەردەیت و جۆگەلەش بۆ ئەو تێبەردانە ڕاکێشیت و هەر لە ماد و پێش مادەوە، بە دەور و تەسلیم، تاکوو بەرەو کۆتایی سەدەی بیستەم پێبەپێ بەناوی هەرای چینایەتی جغزی تێبەردانەکە لە یەک بکێشیتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ فیۆداڵدا سەرمایەدار و غەیبپەرست و ئەو وەتەنیانەش بگرێتەوە کە هەرای چینایەتی ڕای لێیان نییە؟

ئەمیر کە دەڵێ «نابێ تناقضی چینی دەرەبەگی کورد و دەرەبەگی بێگانە (دەبوو بڵێ حکوومەتی بێگانە) لەگەڵ تناقضی گەلی کورد و دوژمانی تێکەڵ بکرێ» مەبەستی ئەوەیە بڵێ دوژمانی کورد بریتین لە دەرەبەگی کورد و دەرەبەگی بێگانە، قسەش لەگەڵ مێژووی ڕابردووە، بەڵام کە دەڵێ «بە تایبەتی لە ئاخرو ئۆخری قەرنی 19 ڕا تا ئێستا» بە یەکجاری ڕابردوو لەگەڵ حازردا گرێ دەدات و ملّکداری کورد و حکوومەتی حەمە ڕەزا بە یەک چاو سەیر دەکا، کەچی لە نێوان هەمووچینەکانی کورددا هەر شیخ عوبەیدوڵا و هەمزاغی مەنگوڕ و سمکۆ و قازی محەمەد و چەند دەرەبەگی دیکە لە حکوومەتی قاجار و پەهلەوی هەڵگەڕانەوە، بەو پێیە دەبێ دەرەبەگی کورد لە خۆی هەڵگەڕابێتەوە...

ئەمە دەڵێم لە گەڵ ئەوەشدا دەزانم کێشەی پرسیاری چارەنووسی کورد فەرقێکی نەدەکرد ئەگەر سەرەڕای ئەو کوردە یاخیانەی ئێران بەدرخان پاشا و شێخ سەعیدی پیرانیش دۆست و خزمەتکاری بێگانە بوونایە، هەروەها چارەنووسەکە فەرقێکی نەدەکرد ئەگەر تاکێکی ملکدار و پارەدار و عەمامەدار و کەشیدەسەوز لە بنەڕەتەوە خەڵق نەبوونایە (قسەشمان لە «چارەنووس»ـە ئەگینا نەبوونی ئەو هەموو تاقمانە کوردی دەگێڕایەوە بۆ پلەی پێش ملکداری کە دەکاتە پلەی شوانکارەیی) چونکە نەخشەکێشی چارەنووسی کورد هێزە ناوەکیە هەمەچەشنە موتەناقزەکەی میللەتی کورد نەبووە.

من لە قسەدا گوتوومە چارەنووسی کورد فەرقێکی ئەوتۆی نەدەکرد ئەگەر هەموو تاکێکی کورد هێندەی پڵنگ چاپووک و هێندەی ئەرستۆ زانابوایە، چونکە بەرەنگاری واقیعێکی نالەباری خەفەکەری نەفەسبڕی کوشندەی دڕندەی دەورەلێداوی دەبوو، بەو چەند هەزاران هەزارەی پڵنگ و ئەرستۆ و لە باڵ یەک هەڵنەدەوەشایەوە.

ئەمیر کە دەڵێ «لە قەرنی 16-17دا ئەو دوو تەناقضە تا ڕادەیەک تەتبیقیان هەبوو» مەبەستیەتی بڵێ لەو دوو سەدەیەدا فیۆداڵی کوردیش وەک میللەتی کورد دوژمنی فیۆداڵی بێگانە بووە. قسەکەی لە زەیمنی ڕاستیەکی یەکجار گەورەتردا ڕاستە، هەر بۆیەیشە ناتەواوە: فیۆداڵی کورد و لەوان گەوەرتر حووکمداری کورد، کە سیفەتی کوردبوونیان بەشێکی پێکهێنەری بنجیانە (چونکە ئەگەر کورد نەبوونایە نە ئەوە دەبوون کە هەبوون نە دەکەوتنە بەر ئەو تاو و تینەش کە تێکڕای کوردی دەکەوتە بەر) بە دەست خۆیان نەبوون هەمیشە خۆیان لە دەوروبەرێکی ژێر دەست و هەڕەشە لێکراو و چەمبۆڵە لێگیرکراودا دەدیتەوە، تا ئەگەر وەک گەلە گورگێکی نێوان مێگەلی مەڕیشیان حساب بکەین دەبێ دان بەوەدا بهێنین کە گەلەپڵنگێک بەسەر ئەوان و مێگەلە مەڕەکەشدا زاڵ بووە و هەردووکیانی

کردووە بە خۆراکی خۆیی و بۆتە لەمپەر لە پێش ئەوەی کە گورگە کوردەکە بە گۆڕانی بایۆلۆجی تێهەڵکشێ بەرەو پلەی «پڵنگایەتی»...

فیۆداڵی کورد ئەگەر گورگ بوو بێت، لە ژێر چەپۆکی بێگانەدا هەرگیز نەیتوانیوە ببێتە پڵینگ. مێژووی کورد بە خۆی و قۆناخەکانیەوە شەپڕەلێداو بووە وەک منداڵێکی تووشی ئیفلیجی ساوایان بووبێت هەرگیز ئەو نەشونمایە ناکات کە مرۆڤە ساغوسەلیم دەیکات. فیۆدالی کوردیش (ڕاستیەکەی دەبێ بڵێین مڵکداری کورد) هەرگیز لە فراژیبوونی شەپڕە لێدراوی خۆیدا پلەی حووکمداری وەک بابان و سۆرانی تێ نەپەڕاند. ئنجا ئەگەر ڕق و بوغزی خوێنگەرمەکانی کورد بەرەو مڵکداری کورد سەر بکات دەبێ لەعنەتی هەرە گەورە لەو کەسانە بکات کە لە ژووورووی مڵکدارانەوە بۆ ماوەیەک لە پلەی «حوکمداری» دا فەرمانڕەوا بوون و ئەگەر بێگانە لێی تێک نەدابانایە «دەولەتی کوردی» یان بنیات دەنا و چارەنووسی کوردیان ڕەنگ ڕێژ دەکرد.

هەرچەند بێگومان لەو بەینەدا ئەوانیش وەک فەرمانڕەوای غەیری کورد دەست درێژیان لەم و لەو دەکرد. ڕاستیەکەی ئێمە ئەگەر لە کولانەی چارەنووسەوە سەیری ئەو شەپڕەلێدانە بکەین و بە پێوانەی «قەومایەتی» دەردەکە هەڵکێشین دەبێ تازیەی بۆ دانێین. خۆ ئەگەر لە کولانەی فەلسەفەی چینایەتی نوختە نیگای «چەوساندنەوە هۆی بەرهەمهێنان» ـەوە سەیری مەسەلەکە بکەین دەبێ ئاهەنگی کەیف و خۆشی بگێڕین چونکە، سپاس بۆ بێگانە و مێژوو و دەردی شەپڕە، زاڵمەکانمان بەر لەوەی «خوێنمشتن» ـەکەیان تێدا ببێتەوە بە هێز و خوێن و گەرمایی تین و تاو و هەناسەیان بڕاو و دەفن بوون.

ئەمەیە ڕاستی مەسەلەکە، تا ئێستاش چەپڕۆی کورد هەروەهای مامڵەت لەگەڵدا کردووە، دیمەنەکەش هێندە ئاشکرایە پێویستە نەزەرییە خۆی لێ

هەڵێنجێت نەک لە ڕێی بەسەردا بڕینی عاملی ئابووری و هۆی بەرهەمەوە تەمومژی تێ بئاڵێنین و دیمەنەکەمان لەبەر چاوان سەرەوبن ببێ. من دەزانم و تۆش دەزانی نەخوێندووش دەزانێت ستەم لە لایەن دەست ڕۆیشتووەوە، بگرە لە لایەن هەموو خاوەن حەزو ئارەزوویەکەوە، ڕاستیەکی سەرەتاییە هەروەک خۆدانە پاڵ بێگانە لە لایەن چەند مڵکدارێکەوە ئەویش بارتەقای ڕەوشەنی چێشتەنگاوی بەهاران ڕەوشەنە.

بەو لای مڵکدارەوە ژمارەیەکی زۆریش لە هەژاران دەبنە جاسوسی بێگانە دژی دراوسێکانیان، هەزار دەرسی دیکەی تاڵیش لە مێژووی تێکڕای مرۆڤ و دەرسی تاڵتریش لە مێژووی میللەتی ژێر دەست دەخوێنینەوە، بەڵام ئەمانە هەمووی تیۆری «ڕاست و دروستی هۆی بەرهەمهێنان» نابنە بنەما و «ماهیە»ی مێژووی کورد... دەخلێکیان بەسەر چارەنووسی کوردەوە نییە... ڕووناککەرەوەی ڕێگەی خەباتی کورد نیین... یارمەتی دەری ڕزگاربوونی نین. کە بێین هەڵکەوتی کۆن و نوێی میللەتی کورد لە ژێر پێی داگیرکەرەکەی بخەینە بەر سەرنجی بێ لایەنگیری و لەوەوە چارەیەک ڕەچاو بکەین دەبینین تیۆری چینایەتی و دەوری هۆی بەرهەم و کوتانەوەی باسی کۆنە فیۆداڵ و سەرکوت کردنی ئەو سەرمایەیەی جارێ لەناو کوردا نەزاوە هەموویان هەر بەقەدەر تیۆری «داروین» لەبارەی بەرەو پێشچوونی خۆرسکی ژینەوەران دەتوانین یاریدەی کورد بدەن چونکە لەوە تێپەڕ ناکەن کە باسی ئەمر واقعێکی بەسەرچووی بێت.

ئێمە هەر وەک دەستمان ناگاتە چەندوچۆنی حاڵ و باری ئەو ئینسانەی کەوا بەر لە هێندە ملیۆن ساڵە خزمی مەیموون بوو، هەروەهاش حاڵ و باری فەلاح و مڵکدار و فیۆداڵی کوردی بەر لە سەد ساڵ و سێ هەزار ساڵ بە هەموو دزێوی و ستەمێکی تێیدا بووە، بە خەون و وڕێنەش دەسەڵاتی ئێمەی ناگاتێ. لە دەور کردنەوەی ئەو مەئساتە کۆمەڵایەتیانەی بوونەتەماڵی مێژوو ڕایەکی «ئەنگلز» م بەبیر دێتەوە کە لە دژی «دوهرینگ» دا دەری بڕیوە،

دەڵێ: بەر لەوەی ئابووری پێش بکەوێ هەرچی دەردی کۆمەڵایەتی هەیە، بێ دەرمان لە وێنەی «مەئاسات» دا دەمێننەوە. لە نوسینی دیکەمدا ئەم قسەیەم بە بەڵگەی ڕای خۆم هێناوەتەوە لەگەڵ نەختێک سازاندن بەوەدا لە جیاتی وشەی «ئابووری» هاتووم «کۆمەڵایەتی» م پێشنیاز کردووە...
چارەنووسی کوردیش نە بەهەڵبەستنی خەباتی ڕوونەداو و نە بە تف لە فیۆداڵ کردن نەک هەر ناگۆڕێت، بگرە ئەگەر ئەو هەڵبەستن و تف لێ کردنە نیگای گەنجی خوێن گەرم لێڵ بکا و بکێشێتەوە بۆ مەجبوور کردنی فیۆداڵ و مڵکدار و پارەداری کورد کە بەرەو خیانەتەوە بڕوات نیوەی گوناهی ئەو خیانەتە دەچێتەوە ئەستۆی تیۆری و مامۆستاکانی ئەو تیۆرییە و تێکڕای گەنجە خوێنگەرمەکان.

لە تەمووزی 1960 بە عەرەبی لە گوتارێکدا گوتومە: کورد موحتاجە بە هەڵمەتی دار و بەردەکەی و ئەوەی بە ئاسمانیەوە دەفڕێت و لەسەر ئەرز دەڕوات، ئیتر چۆن ڕەوایە لە باری وەهادا شەڕی چینایەتی و ڕەشەبای ئومەمیەت پەرت و بڵاوی بکات.

لە تێکڕای ئەو تێبینیانەوە ڕوون دەبێتەوە کەوا هەڵبەستنی خەباتی فەلاح دژی مڵکداری کۆن نە بۆ چارەنووسی تێکڕای ئادەمیزاد و نە بۆ چارەنووسی تایبەتی کورد چ کەڵکێکی پێوەیە، خۆ ئەو تەرزە فەلسەفەیە کە خەباتی چینایەتی پێش خەباتی قەومایەتی دەیەخێت، ئەگەر لە جڵەوی مەیلی زۆر بەهێزی بۆ لای چین نەداتەوە بە تەواوی پشت لە قەومایەتی دەکات، نموونەیەکی زێدە بەرچاوی ئەم هەڵوەستە بەرەواژە هەڵوەستی پارتی کۆمەنیستی فرەنسە بوو بەرانبەر شەڕی دووەم دوای ڕێککەوتنەکەی ستالین و هیتلەر لەسەر دابەش کردنی پۆلۆنیا ئێمە ئەگەر چاویش لە ستالین بپۆشین بەوەدا کە بڵێین یا مەبەستی پاراستنی وڵاتەکەی خۆی بوو وەیا هەر نەبێ بە سەهوودا چوو، ناتوانین بەهیچ کلۆجێک لەسەر کۆمۆنیستەکانی ئەوسای فەرەنسە بکەینەوە، چونکە لە هەموو ڕوویەکەوە «کوڕی خۆیان بە قوربانی

کچی خەڵق دەکرد» . حاڵ و باری کورد و میللەتی بێهێزی وەک ئەو بە بۆرە تەئویلیش هیچ عوزری ئەو خۆ بە قوربانی خەڵق کردنەیان لێ ناسەلمێنرێ تەنانەت هێندەی کۆمیۆنیزمی فەرەنسەش عوزر و بەهانەیان بەدەستەوە نییە، چونکە هەر نەبێ ئەندامی ئینتەرناشناڵ بوون، خۆ کورد هیچ نەبوو… هیچیش نییە!!

لە بەرەو کۆتایی ئەو وەڵامەدا لەسەر ڕایەکی مامۆستا ئەمیردا دێمەوە کە پێشتر بە جۆرێکی لابەلایی سەرەڕەو پێیدا تێپەڕیم. مامۆستا ئەمیر دەنوسێت «بەڵام دیسان ئاشکرایە کە هونەرو ئەدەبی فۆداڵی فەرەنسە زۆر تر لە هونەر و ئەدەبی فئۆدالی ئینگلیزو یابان…. نزیکترە تا لە هونەر و ئەدەبی سەرمایەداری «ئێستەی» فەرانسە» .

ئەم باسەی گێڕانەوەی ئەدەب و هونەر بۆ ئەو سەرچاوانە و ئەو کاریگەریانەی دەستیان هەیە لە داڕشتن و ڕەنگرێژ کردنیان بەرەو قوڵایی و فرەوانی ئەوتۆوەمان دەبات ڕەنگە لێی دەرنەچین چونکە ئەدەب و هونەر و تێکڕای چالاکی هۆشەکی نەفسی مرۆڤ کە پێوەندی بە دەروونی مرۆڤەوە هەیە نەک تەنها بە ماددەی مردوو وەیا گیانەوەری بێهۆش، لک و پۆپ و ڕەگ و تان و پۆی بەرەو هەموو ئەو لایەنانەدا دەڕوات کە هۆش و نەفس و عاتیفە و هەست و نەست و حەز و شەهوەت و… هەموو وجودی مەعنەوی مرۆڤی بۆ دەڕوات سەرەڕای ئەو دەوروبەری مرۆڤەکەی لە باوەش گرتووە… دەوروبەریش وەها فرەوانە ئەویش بریتیە لە سروشت و هەڵکەوتنی ماددی مرۆڤکرد و لە میراتی سەقافی تا دەگاتە ئەو مامۆستایەی کە بە ڕێکەوت دەبێتە کارتێکەر وەیا ڕابەری ئەدیب و هونەرکاری شلک.

ڕاستیەکەی بە کەس ناکرێ بزانێ فلانە ئەدیب وەیا هونەرکار لە چ بۆتەیەکی فیکری و کۆمەڵایەتی نەفسی لەبەر تیشکی کام ئاوێنەی ڕەنگدەرەوەی تین و تاوی سۆز و پەرۆشدا قاڵ بووەتەوە. برنادشۆ بۆچی لە

هیچ بیریار و ئەدیب و هونەرکارێکی سەردەمی خۆی نەکرد ئەوەندە نەبێ کە لە دەمی خۆیەوە گوترا نوسینی و ئەو و تەمسیلی چارلی چاپلن یەک شتن... چارلی بۆچی تاکە نموونە بوو. خۆ هەزاران ئەدیب و هەزاران ئاکتەر لە عەینی سەردەم و دەوروبەردا دەژیان؟ کە دەڵێین قۆناخی فیۆداڵ وەیا سەرمایەدار بەوەدا تەنها پەراوێزێکی پان و پۆڕ و فشەڵۆکمان بە دەوری تاک تاکی ئەو ناوەڕۆکەی تێیدا دەژین گێڕاوە، کە ناتوانێ «هویە» بۆ هیچ یەکێک لەو تاکانە دەر بکات.

بێگومان پەراوێزی «ئایین» پتر لە قۆناخی مێژوویی هەویەی پێ دەردەکرێ وەک کە دەبینین ئەدیبی ئیسلام لە نێوان خۆیاندا لە دەورێکەوە بۆ دەورێک لەگەڵ یەکتردا خزمترن تا ئەوەی لەگەڵ ئەدیبی مەسیحی هاوچەرخیاندا خزم بن، خۆ لە لایەن وێنە و پەیکەرەوە قسە کردن لە هاوچوونی هونەرکاریی ئیسلام و مەسیحی هەر بەجارێ پوچەڵە چونکە لە ئیسلامدا حەرامن. کەسیش ڕێی نییە بڵی هەمان فیۆداڵی کە لە مەسیحیەتدا حەلاڵی کردن هەر خۆی بوو هات لە ئیسلامدا حەرامی کردن هەروەک ڕێش نییە بگوترێ فیۆداڵ لە وڵاتێکدا خوشک و برای پێک شیاندن و لە وڵاتێکی دیکەشدا لە یەکتری حەرام کردن وەیا حەلاڵی و حەرامی خورادنانی دەستنیشان کرد...

چەندین مەیدانی دیکەی کۆمەڵایەتی هەیە کە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێک دەگۆڕین، هەمووشیان هەر فیۆداڵ وەیا سەرمایەدارن، ئەو مەیدانانەش پتر لێیان دەوەشێتەوە بکەونە بەر فەرمانی دەسەڵاتدار تا ئەدەب و هونەر وەک ئەوەی کە دەبوو مەسەلەی «زۆر ژنە» و «تاک ژنە» بەر پێداویستی گوزەران بکەوێت و بدرێتەوە بە ڕێژیمی ئابووری و هۆی بەرهەمهێنان کەچی مسڵمان و مەسیحی دراوسێی دەرک و دەرک تێدا جوداوازن تا ئەوەی ڕەنگە عەینی ئەو جوداوازیە بەس بێ بۆ ئەوەی یەکیان ئەوی دیکە بە کافر بزانێ ...

موسڵمان و هیندۆس لەسەر مەسەلەی «قوربانی» کە بریتیە لە گۆشت خواردن و بژێو و کارێکی ماددی ڕووتە هەرایەک دەنێنەوە نە بە فیۆداڵ و نە بە حکوومەت و نە بە نوشتە و کشتەکیش چاری دەکرێ. تەنانەت ئەگەر دوو حکوومەتیان هەبێت حکوومەت و فیۆداڵی هەر یەک لەو دوو وڵاتە پشتگیری لە بەشە هەرای لای خۆی دەکات، فەلاح و عەمەلە و کاسبکار و پارەدار و ئافرەت و پیر و جحێلی هەردوو لاش هەروەها، لە بەرایی هەمووشیانەوە پیاوە ئایینیەکان کەوا کێشەکە لە بنەڕەتەوە دەچێتەوە بۆ «باوەڕ» . ئنجا ئەگەر بشگوترێ باوەڕەکانیش لە بنەڕەتەوە بە ماددە بەستراونەتەوە وەک ئەوەی کە قودسیەتی مانگا لەو سوودەوە هاتبێ کە بە ئادەمیزادی دەگەیەنێ دیسانەوە لە دوو ڕووی گرنگەوە پێوەندی کێشەکە بە ماددەوە دەپچڕێ: یەکەمیان ئەوەیە کە ئەگەر «سوود، ماددە» بنەڕەتی بوونایە دەبوو موسڵمانیش وەک هیندۆس بێت وەیا هیندۆسەکە وەک موسڵمان بێت... دووەمیان ئەوەیە، پاش ئەوەی سوودەکە بوو بە بنەمای قودسیەتی مانگا، سەرلەنوێ قودسیەتەکە بوو بەهۆی کوشتنی ئەو سوودەی لە کوشتنەوەی مانگە دەستی مرۆڤ دەکەوێ، خەڵقەکەش چ ئاگای لە تەعلیلاتی بیریاری ماددی نییە لەوەدا کە خەریکە لێڵایی حورمەتی مانای بۆ دەباتەوە سەر بنچینەی «ڕووناک» یی ماددی.

ئەو تێبینیانە و دەیان و سەدانی وەک ئەوان کە لە هەموو ڕووپێوێکی ڕوخسار و ناوەڕۆکی بوونی ماددی و مەعنەوی مرۆڤەوە بەڵگەی کاریگەر بوونی مرۆڤەکە، کە مامڵەت لەگەڵ بوونەوەردا دەکات، بە دەستەوە دەدەن و نرخی دەورەبەر و ماددە و پلەی گۆڕان و هۆی بەرهەمهێنانیش لە کاریگەربوونی هەوڵ و تەقەلای مرۆڤدا نیشان دەدەن (بە چاک بێ وەیا بەخراپ) تێشکێک دەهاوێژن بەرەو ئەو ڕووکارەی کە ڕایەکەی مامۆستا ئەمیر بۆی دەڕوات و منیش دەمەوێ بە پێی باوەڕی خۆم ڕووی پێ بابدەمەوە وەلای واقیعێکی یەکجار فرەوانتر لە ڕێژیمی ئابووری کە بشێ

ئەدەب و هونەری ئێستاکەی فرەنسە و میللەتانی دیکەی وەک ئەوی لێ مارە بکرێ.

مامۆستا ئەمیر!

هونەر و ئەدەبی ئێستای فرەنسە کە تۆ دەیدەیتەوە بە «سەرمایەداری» ئێستای فرەنسە، لە ڕاستیدا، هونەر و ئەدەبی فرەسنەی ئاخەلێوەی سەدەی بیستەمە بە هەموو هاندەر و پەکخەر و پاشخەریەوە هەر لە بەرەی ڕاستی پەڕگیریەوە تا بەرەی چەپی پەڕگیریەوە کە وا زۆر جاران پێداویستی بەرژەوەندی «سەرمایە» لە ڕووی ئابووریەوە تێیدا پێشڕەوترە لەو چەپڕۆیەی بەلای خۆی و تێۆریەکەیەوە جڵەوکێشی کاروانی ڕووەو گەشایی و ئازادییە. لە فرەنسەی ئێستاکەدا پوختە و پیرایش دراوی هەموو قۆناخە مێژوویەکان بە خۆیان و بەشێکی زۆری ئەو باوەڕ و فەلسەفانەی لەگەڵیاندا ژیان و پێکرا سەرەوژێر بوونەتەوە بۆ ئەم ڕۆژگارە، خەریکن بە یەکەوە دەژین و تێک دەکەنەوەو لێک دەسڵەمێنەوە پێکدادێنەوە و دەست لە ملانەی یەکتر دەبنەوە تا ئەوەی دوور نییە قەشەیەکی دڵسۆزی کەنیسە برادەری هونەرکارێکی مولحید بێت وەیان نووسەرێکی کۆمۆنیستی فەرنسی لە کاتی بەدەمداهاتنەوەی کۆمۆنیستێکی وەکوو خۆی هانا بباتەوە بەر دروشمەکانی لێبراڵیەتی وەیا «سارتەر» ی وجودی ڕۆژنامەی پارتی کۆمۆنیستی چین بفرۆشێت.

هونەر و زانست و ئەدەب و فەلسەفە و باوەڕ و داب و نەریتێکی کە ئێستا لە فەرەنسەدا باوە بە هیچ پێوانەیەک لە هیچ لێکدانەوەیەکدا بەلای پلەی «سەرمایەدار» ی دا ناچێتەوە بەو شێوەی کە لە نووسینەکەی ئەمیر و لە داخوازی مەفهومی «چینایەتی» دا بەدی دەکرێ. مانای چی هونەری

سەرمایەداری؟ ئەدەبی سەرمایەداری؟ ئێمە تێدەگەین بگوترێ «ئەدەب و هونەری وڵاتی کۆمۆنیست» چونکە لەو ڕێژیمەدا ئەو بۆچوونەی وەها دادەنێ کە ئەدەبی فرەنسەی ئێستا هی سەرمایەداری بێ یەکسەر ئەدەبەکەی وڵاتی خۆیشی دەداتەوە بە پرۆلیتاریا کە گۆیا خاوەنی حووکمە. ئنجا ئەگەر لە فەرەنسەدا واقیع ئەوە نەبوو کە کۆمیۆنیزم دەیگوت، خۆ کۆمۆنیزم لە وڵاتی خۆیدا دەستی نەگیراوە بەو لای ئەدەب و هونەرەوە مۆدیلی جلک و موسی تراشیش بەو قاڵبە دابندرێ کە بە ڕواڵەت لە بڕیاری پرۆلیتاریا بوەشێتەوە.

لە ڕژێمی کۆمۆنیستدا ئەدیب و هونەرکار و سەنعەتکار و تەماعکاریش هەموویان فەرمانبەر و مووچەخۆری حکوومەتن و لەوانەیە بە «امر اداری» گوتاری بنووسن وەیا تەمسیل ڕێکبێخن هەروەک فەلاحیش بە فەرمانی کەسانی لەخۆی بەرەو ژوور پەتاتە دەچێنێ. ڕابەرانی ئەو وڵاتانەی بە زاهیر حکوومەتیان لەسەر بنەمای پرۆلیتاریا دامەزراوە، بۆ ئەوەی ڕەوابوونی سەرپەرشتی حکوومەت لە ئەدەب و هونەر و جموجۆڵی کۆمەڵایەتی بە ئیسپات بگەیەنن ناچارن بڵێن ئەدەب و هونەری هەر وڵاتە نوێنەری چینی دەسەڵاتداریەتی. بەو پێیە لە خۆوە بێ هیچ بەڵگەی دیکە ئەدەب و هونەری وڵاتی کۆمۆنیست دەبێتە نوێنەری داخوازیەکانی چینی پرۆلیتاریا کە گۆیا لەوێدا خاوەن حکوومەتە، ئەدەب و هونەری فرەنسەی (سەرمایەدار) یش دەبێتە خزمەتکاری سەرمایە، هیچ بەلای ئەو ڕاستیەشدا ناچێت کە بە قەدەر پێدا هەڵگوتنی ڕژێمی کۆمۆنیست لە لایەن ئەدیب و هونەرکاریەکانەوە، ئەدیب و هونەرکاری فەرەنسە ڕەخنە لە حکوومەتی فرەنسە دەگرن و بەگژیدا دێنەوە و ڕیسواشی دەکەن. لە ئاشکرا ئاشکراترە کە ڕژێمی کۆمۆنیست هەر بەپێی دەقی ئەو نەزەریەی کە لێوە هەڵقوڵیوە هیچ ڕەخنەیەک ناسەلمێنێ، ئەوەی دەنگی ناڕەزامەندیش بەرزبکاتەوە یەکسەر لە بەر تیشکی ئەو نەزەریەدا بە دوژمنی پرۆلیتاریا حساب دەکرێ و مافی ئازادی بیروڕای دەدۆڕێنێ ئەگەر مافی ئازادی خۆیشی نەدۆڕێنێ، چونکە دۆڕاندنی مافی دەربڕینی بیروڕا یەکەم سزادانی دوژمنە.

له فرەنسەدا باری سیاسی و ڕۆشنبیری و ئابووری پێچەوانەی ئەو بارەیە
چونکە هەر ئەدیبێک و هونەرکارێکی لە هیچەوە بە چالاکیەکانی
حکوومەتەکەیدا هەڵگوت ڕاستەوخۆ ئیفلاس دەکات.

کێ دەتوانێ سەرژماری فێرگە جوداکانی ئەدەب و هونەری فرەنسەی
سەردەم بە وردی بزانێ؟ کێ دەتوانێ لەو فێرگانەدا کە نایەنە ئەژمار یەک
دوانێک بدۆزێتەوە بە شان باهووی سەرمایەداریدا هەڵبڵێ. ئەدیب و
هونەرکاری فرەنسەیی زۆرن کە بێ پەروا دۆستی سۆڤیەت و بێ پەروا دژی
حکوومەتی فرەنسەن، هەمووشیان بە کێشانە و پێوانەی «چینایەتی» بۆ لای
سەرمایەداری دەچنەوە. دابڕینی سەرەناوی «سەرمایەدار» بەسەر ئەدەب و
هونەری فرەنسەی ئەم ڕۆژگارەدا پتر لە ڕاستیدا دوورە تا ئەوەی بە فیلمی
کارتوونی سۆڤیەت بگوترێ «ئەفسانە پەرست» چونکە قارەمانەکانیان بە
زۆری ئەمیر و ساحیر و پیاوی ئایین و موعجیزە سازن (وا دەزانم
وێنەکێشانی ئەو فیلمانە لە ڕاگەیاندنی فەرمانی ڕەسمی کەلەبەری وەها
دەدۆزنەوە بشێ دیمەنی ئازادی دەرەوەی دەقە بەرتەسکەکانی نەزەریەی پێدا
تێپەڕێنن، ئەمەش جۆرە ئاکامێکی تەسکی و تروسکی ئینجیلی نەزەرەیەیە و
هونەری لێوەتەنگ دێت بەر لە ئەدەب، وەک دەشزانین وتووێژی هونەر
تەماوی ترە لە هی ئەدەب و درەنگتر دەگەزێت و دەبڕێت، پتریش چاوی لێ
دەپۆشرێت).

لەم جیهانەدا ئەگەر چەند دیمەنێک هەبێت بایەخی بە شکۆی
فەرمانی «سەرمایە» نەدابێت هونەر و ئەدەبی فرەنسەی ئەو ڕۆژگارەیە:
هەروەک «زانست» ی موختەبەر پرس بە بازاڕ و بانک و فابریقە و بووڕسە
ناکات و پاریس و مۆسکۆ تێدا دەگەنەوە یەکتر، هەروەها ئەدەب و هونەری
فرەنسە لەو بنکە ئابووریانە بێ باک و بێ نیازە، تەنانەت لەگەڵ ئەدەب و
هونەری سۆڤیەتیش یەکدیان دەگرتەوە ئەگەر مۆسکۆ ڕێگەیان لێ نەبەستێ
چونکە سەرەڕای ئەوەی کە ئەدەب و هونەر زەنەی دەروونی مرۆڤن پتر

لەوەی وەک ئاوێنە ڕەنگ و تیشک دەرەوە بن، دەوروبەر و جیهانی کۆمەڵایەتی و تێکڕای وجودی زاتی مرۆڤیش لەم چەرخەدا وەها لەیەکدی نزیکبوونەتەوە دەشێ میوانێکی مۆسکۆ لەگەڵ میوانێکی پاریس هەست بە جواداوازیەکی لە ئەندازە بەدەر نەکەن. خۆ ئەگەر مۆسکۆ تەدەخلی هەمەکار لە چەندوچونی هۆتیل و بازاڕ و جێی ڕابواردن نەکات زۆر نابات ڕووسیاش شانزەلیزیەی لێ پەیدا دەبێ و دەیان فێرگەی ئەدەبی و فەنی تێدا نما دەکات... لەوساوە هۆی بەیەکدی گەیشتن و یەکدی دیتن و لێکدی حاڵیبوون زۆربووە دیواری جوداوازی و بێگانەیی و لە یەکدی سڵەمینەوە تەنک بووە: ئەوەی لەمپەڕی گەورەیە لە نێوان خەڵقدا تەدەخولی سیاسەتە کە نایەلێ جۆگەلەکانی هەمەچەشنەی بیروباوەڕ تێکبکەنەوە هەروەک لە زۆر باردا پێشی ئابووریش دەگرێت و خەفەی دەکات وەیا ڕووی تێوەردەگێرێ وەیا لێی دەقرتێنێ و تاوتووی دەکات.

بێگومان لە بەرەڵا کردنی مەیلی هونەرکار و ئەدیب، ئەو وڵاتەی کە هونەر و ئەدەب تێیدا «موچە» دەیەوێ لە جغزی «توجیە» دەرچێت چونکە ئەدەب و هونەری بێ «توجیە» و بێ چاو لێ سوورکەرەوە لە خۆوە حەز ناکا دیوار بەدەورەیوە هەڵنری و چاودێر بەدیاریەوە بێ. تۆ ئەگەر ڕێ بدەیت بە ئافرەتان کە سەرپشک بن لەوەی کە دەیکەن و دەپۆشن و دەخۆن و دەڵێن و دەچڕن، ئافرەتی دەورە لێدراو لاسایی ئافرەتی دەورە لێنەدراو دەکەنەوە. دیارە ئەدیب و هونەرکاریش هەروەهان. جا ئەگەر هەموو دیوارێک لە بەیندا هەڵستێت ئەدیبی مۆسکۆ بەلای ئەدیبی فرەنسەدا دەچێتەوە با هەر کۆمۆنیستیش بێ چونکە باشتر دەتوانێ تەعیبر لەو جۆرە کۆمۆنیزمە بداتەوە کە باوەڕی پێ هەیە.

سەرەتای ئەم دیمەنەش بە جۆرێکی شەرمنانە و دوودڵانە لە هەندێ بەرهەمی هونەری سۆڤیەت بەدەر دەداتەوە، بەڵام ئەوەی تا ئێستا دەیبیسین و دەیبینین کەمترە لەوەی کە ئەگەر ڕێی لێ نەبەسترابایە دەمان بیست و

دەمان دیت، وەک دەشگێڕنەوە بەرهەمی ڕەخنەگری ئەوتۆ هەیە لە سۆڤیەت بۆ ناو وڵات ڕێی پێدراوە بەڵام، جارێ، بۆ دەرەوە یاساغە.

کورتەی قسە ئەوەیە ئەدەب و هونەر لە «مرۆڤایەتی» ەوە هەڵدەقولێ نەک لە دەمارێکی وەیا تیریژێکی، کە دەشلێم مرۆڤایەتی مەبەستم لە هەموو وجودی ئادەمیزادە بە «خۆیی» و کۆمەڵایەتی و مێژوو و تەفاعولی لەگەڵ دەوروبەردا کە دەشلێم «خۆی» مەبەستم لە هەموو لایەنەکانیەتی بە چاک و بەد و موحاید و زکماک و موکتەسەبیەوە. ئەوشتانەی لە مرۆڤیشەوە سەر وەدەر دەنێن هەتا بەلای مەعنەویاتدا بڕوات کەمتر مەحکوومی ڕێژیمی ئابوورییە پتریش دەتوانێ لە واقیعی جۆراوجۆر و لە یەکدی نەکردوودا بژیت، مەعنەویات (تەجریدیش دەگرێتەوە) ئاسانتر بە مەعنەویات دەگۆڕێت وەک ئەوەی ئیسلامەتی زەردەشتیەتی پێچایەوە هەرچەند موڵکداری (فیۆداڵ- ئەگەر هەبووبێت) وەک خۆی مایەوە. باری ئابووری لە ڕێی دەسەڵاتی سیاسییەوە، بە زەبری کوتەک نەک بە تەمای شیرنایی ڕووت، دەتوانێ مەعنەویات خەفە بکات، تەنانەت وەها بووە دیندار و ئەدیب و هونەرکار هەموو سامانی خۆیانیان بە مەفتەنەوە واز لێهێناوە بۆ تاکە مەبەستی پاراستنی دەروونیان. مرۆڤ کە ترسی لێ نیشت بە ئاسانی دەست لە موڵک و پارە هەڵدەگرێ بەڵام زۆر بە زەحمەت و بە سفتوسۆ لە ڕێی ترساندنەوە تف لەو ئاورینگە دەکات کە لە هەناویدا جلوەی بەستووە، ئیتر ئاورینگی دین بێت وەیا نیشتمان وەیا چین وەیا بووت وەیا شێخ... وەیا... وەیا...

مەیدانی زاڵبوونی «سەرمایە» لە فرەنسەدا نە هونەرە نە ئەدەب. لەم دوو مەیدانەدا سەرمایە موفلسە و کەسی بەدوادا نایەت. لە وڵاتی پێشکەوتووی وەک فرەنسەدا سەرمایە بە ڕێچکۆڵەی پێچەڵپێچ و تێک ئاڵقاودا تین و تاوی خۆی دەگەێنێتە مەیدانی سیاسەت، لەوێشدا چەنگە و بازی غەریمی سیاسی دەبێت نەک فەلسەفە و هونەر و ئەدەب. ئەوەی ڕاستیش بێ زۆرجاران خاوەن پرۆژەی ئابووری زێدە سوودبەخش و خاوێن هوروژمی دەبردرێتی لە

لایەن نووسەری بێ باکەوە و تووشی سەخڵەتی و تێشکانیش دێت هەر چونکە کەس لەسەری ناکاتەوە، خاوەن پرۆژەکە بۆ خۆیشی نووسەر نییە بتوانێ بەڵگەی سوود بەخشی و خاوێنی پرۆژەکەی بگەیێنێتە بەر هەست و چاوی خوێنەرانەوە. بە عادەت ئەگەر سەرمایەدار فریشتەش بێت خەریکی پێداویستی پاراستن و بەرەو پێشبردنی کەسبەکەی دەبێت و ناپرژێتە سەر نووسین و فەلسەفەکاری بیردۆزی، ڕێشی تێ ناچێ کەس خۆی تەرخان بکات لە بری ئەو ئەرکی نووسین و لەسەر خۆ کردنەوە هەڵگرێ. خولاسە بەهەر لایەکدا مەسەلەکە وەرگێڕیت هەر ئیسپاتی نەبوونی پێوەندی هونەر و ئەدەب و بە سەرمایەوە دەکات.

ئەو لە یەکدی چوونەی کە لە نێوان ئەدەبی ئێستەی فرەنسە و ئێستەی ئەڵمان و ئێستای وڵاتی ئەوتۆیی دەدیترێت چ پێوەندی بە هاوچوونی باری ئابووری ئەو وڵاتانەوە نییە، بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ چالاکی و خێرایی لە یەکدی وەرگرتن و یەکتر بیستن لای یەکدی خوێندن و تێکەڵبوونی چاپەمەنی هەمەچەشنە و سەدان کاریگەری دیکە کە تێکڕایان دەکێشنەوە سەر لێکتر شارەزابوون و بەیەکتر ئاشنابوون. خوێندەوارانی ئەو وڵاتانە هەر دەڵێی هی یەک وڵاتن چونکە چی بەرهەمی هونەری و ئەدەبی هەر یەکێک لەوان هەیە خێرا بەخێرا لە هەموویاندا بڵاو دەبێتەوە تا وەها دەبێ پارچە مۆسیقای وڵاتێکیان لە دەرەوە کڕیاری پتر دەبێ. گەلێک جاران خەلق کە سەفەر بۆ دەرەوە دەکات هەست بە جێ هێشتنی سنووری وڵاتی خۆی ناکات، چونکە لە هەموو ڕوویێکەوە بەیەکتر گەیشتنیان بێ گرفت بووە. با دوور نەڕۆین بەشێکی سەرمایەی وڵاتی وەک فرەنسە هی هونەرکارەکان وەیا هی بنکەی هونەرەکانە وەک مۆسیقا، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، سینەما، مۆدیلی جلک، ساڵۆنی ئارایشت، هۆڵی دانس... هتد، تۆ ئەگەر بێت و لیستەیەک ڕێکبێخیت بەو هەموو شوێنانەی خەریکی هونەر و جوانی و خوێندەواری و خۆشگوزەرانی و زانست و فکر و فەلسەفە و چشتی ئەوتۆیین دەبینیت ئەو پشکەی سەرمایەی کە بەر ئەوان دەکەوێت لە هێندی شارەکانیاندا پترە لە

هیی سنعەت و تیجارەت، ئنجا تێکڕای ئەو هەموو سەرمایەی لەو هەموو بنگانەدا کار دەکات و بێ ئەوان هونەر و ئەدەب پەیدا نابێت خۆی لەخۆیدا کاریگەرێکی ئابووری بە پۆز و بایەخدارە. جا ئەگەر ئێمە بە تانوپۆی سەرمایەی ئەو وڵاتانەدا بێین و لە نوختەی پێوەندیان بە ئەدەب و هونەرەوە لێیان وردبینەوە دەبینین ئەدەب و هونەر پتر لە سەرمایە دەخۆن، تا ئەوەی سەرمایە دەست بەسەر ئەواندا بگرێت.

لە کۆتایی ئەم نوسینەدا چاوێک بە دەوری سەرمایە لە ئەدەبی کوردی خۆماندا دەگێڕین تا بزانین دەوری چی هەبووە لەو ئەدەبەدا. بەڵام ئەگەر وەها ڕابنوێنین کە کوردی ئەم چەرخە سەرمایەدار حساب دەکرێ دەبێ کوردی سەدەی نۆزدەم فیۆداڵ بووبێت ئەدەبەکەشی کە بریتی بووە لە شیعر فیۆداڵی بووە. قسە لە ئەدەبی سەدەی نۆزدەمان بەوە کورت دەکەمەوە کە بڵێم شیعرمان یەکسەر لە شوێن پێ هەڵگرتنەوەی عەرەبی و فارسیەوە هاتووە، بە عەرووز و بە زۆربەی ئەو بابەتانەی پێیانەوە خەریک بووە لەگەڵ تێچین کردنی تام و بۆنێکی کوردانە کەوا هەر نەبێ بە هاوڕێیەتی زمانەکە لە دەروونی شاعیرەوە بۆ ناو هەڵبەست هاتووە. ئەم قسەیە لە خورد کردنەوەدا، زۆر بەکورتی، چەند خاڵێکی سەرکی بە لیستە دەگرن:

خاڵی یەکەم: پاشخان و ژوورخانی ئاسۆی هەستی شاعیر لە کوردەواریدا بە تێکڕایی ڕووخساری ئیسلامی داوەتەوە هەم لەبەر ئەوەی ئەدەبی عەرەبی و فارسی بە بنکەی ئیسلامەوە بەستراوەتەوە هەم لەبەر ئەوەی کە کورد موسڵمان بووە. لە بەراورد کردندا ئەدەبی تورکیش لەو سەردەمانەدا هەر وەها بووە، بەو لای تورکیەوە ئەدەبی موسڵمانان، سەرلەبەری، ئەو شێوەیەی پێوە بووە. بەڕادەی پێوەندی شاعیریش بە زانستەکانی ئیسلامەوە شەقڵی دینی تێدا دیار بووە واتە هەتا مەلاتر بووبێ بابەت و ڕاوێژی پتر بە لا دیندا چۆتەوە، بەڵام نابێ بیر بۆ ئەوە بڕوات کە شاعیر دەرگەی دنیای لە خۆی داخستوە و نوێنی لە میحرابی مزگەوت و گۆشەی تەکیە و خانەقا ڕاخستوو:

چ لە ڕێی ڕوخسەت بەخۆدانەوە بێ و چ لە ڕێی قسەی بە تویکڵە بێ و چ لە ڕێی تەئویلی تەسەوفەوە بێ شاعیرەکانمان دەمێکیان لە دەم و دەستێکیان لە کەمەر و باسێکیان لە گەردنی دڵدار گیڕاوە، هەندێ جار بەو لا تریشەوە بووتنەوە... دەستیان نەڕزێ.

خاڵی دووەم: هەروەک لەو سەردەمەدا خاوەن بەرژەوەندی ماددی وەک توجار و بازرگان و تێکڕای دوکاندار و مڵکداران تێکەڵ بە سیاسەت نەبوون و زراوڕژاوی حکوومەتەکان بوون، شاعیریش پشت لە سیاسەت بووە بەو پێەیەش شعیرەکانی پشت لە سیاسەت بوون. «سالم» دوای ڕمانی حوکمڕانی بابان بەدەست عوسمانلیەوە، لە ڕێی سفتوسۆی برینێکی کە کەوتۆتە لەشی خۆیی و شارەکەیی و هەرێمەکەی دادوبڕۆیەکی سیاسی لە شیعرەکانی پاش تێچوونی باباندا لە وێنەی نەعرەتەدا دەبیسترێ دەشێ بە یەکەم هەنیسکی ئەو شیوەنە سیاسەیەی حاجی قادر لە ئەستەمبۆڵەوە بەرپای کرد دابرنێ. ئەحمەدی خانی مامۆستای یەکەمی فێرگەی قەومایەتی، هێندە پێش زەمانی خۆی کەوتبۆوە دەنگێ لەو ڕۆژگارانەدا نەدەبیسترا بە تایبەتی لە لایەن ئەو کوردانەی لە شێوە ئاخاوتنی خانی بەڵەد نەبوون.

بەڵام دەبێ بزانین کە خەریک نەبوونی شاعیر بە سیاسەتەوە بەرە ژێری نەکردەوە بۆ نزمایی توجار و بازرگان و مڵکدار و بەقاڵ و هەژار چونکە هەر نەبێ لە بەیت و دوو بەیتدا بە قسە دژی زوڵم دواوە و ناوە ناوە یەخەگیری ئەفسانە بووە و لە ڕێی شیعرەکانیەوە، مەبەستیشی نەبووبێ، زمانی کوردی خزمەت کردووە هەر بە گوتنەوەی ئەو شیعرانە لە لایەن خەڵقەوە گیانی بێ هەرای هەست بەخۆ کردنی لەو خەڵقە گیڕاوە. وەک دەشزانین سەرەتای هەڵبەستی کوردی لە کوردستانی جنوبیدا کە بە نالی و کوردی و سالم دەستی پێکرد و خێرا حاجی قادر و ناوچەی کۆیە و دیوی موکریان و کوردستانی ئێران لێیان قۆستنەوە زۆری نەخایاند دەنگی قەومایەتی خەست و خۆڵی دایەوە. هەر لە پێشەوە مەتحەکانی نالی بۆ حاکمی بابان و پرسە کردنی

لە حاکمێکی دیکەی جۆرە زمان گێڕانێکی خۆیی و زمان ڕاهێنانی دەوروبەرەکەیەتی لە بابەتی سەر بە نەتەوایەتیی کورد. نازناوی «کوردی» کە ڕاگوێستنێکی بەرەو قەومایەتیە لە «هجری» یەوە، خۆی لە خۆیدا گەشەپێدانێکی گیانی کوردایەتیە لەو غەزەلانەی پێی ئارایش دراون وەک:

کوردی بێ کەس خۆم لە هیچ لایی سەدای شینم نەهات

دەنگدانەوەی ئە سەرەتایانەیە لە شیعری حاجی مەلا عەبدوڵادا دەبیسترێ:

بیکەمە کوردی زمانی خۆمە چاکی تێدەگەم

ئەگەر مەلایەتی و کەمتاکورتێکی شیعری ئیبنو ئادەم بدەینەوە بە مەفهومی ئەدەب کۆڵەگەیەکی مەحکەمی خواپەرستی و مەردایەتی و خۆ بەکورد زانین و دادپەروەری ئیبنو ئادەم لە تابلۆی کوردەواریدا دەچێتە ناو جغزی ئەدەبی چەرخی تێپەڕیومان. (لە ناوتوێژی باسی حاجی قادردا ئەم ڕاستیە لە بارەی ئیبنو ئادەمەوە ڕوون کراوەتەوە). ئەو وردە تێبینیانە تێکڕایان دەچنە دەسەتەرازووی تاقی کردنەوەی باسی «ئەدەبی کوردی و فیۆداڵ» و هی لە بیر کردن نین.

خاڵی سێیەم: ئەدەبی کوردی (واتە: شیعری کوردی) سەدەی نۆزدەم ئەگەر لە ڕووی پێوەندی بە مێژووی کۆنەوە لەگەڵ ئەدەب و شیعری فارسیدا بەراورد بکرێ پێیەوە دیارە چەند لەو مێژووە دوور کەوتۆتەوە: یەک لوێچی بچووکی وشەی وەک «مغ، ترسا، اتش پەرەستی، گبر..» لێ بسڕێتەوە کە ئەویش هەر لە ڕێی ئەدەب و مێژووی بێگانەوە پەڕیوەتەوە بۆ ناو هەڵبەستی کوردی، هیچی ئەو تۆ لە سەقافەتی زەردەشتی و خڵتەی کۆمەڵایەتی ئەو ئایینە بە شیعری کوردی ئەو چەرخەوە دیار نییە، کەچی لە شیعری فارسیدا و لە تێکڕای ئەدەب و مێژووی هەزار ساڵەیدا «ڕوودەکی و فیردەوسی» و هاومەشرەبەکانیان دەست پێ دەکات، ئایین و نەریت و ئەفسانە و شێوە

جۆراوجۆرەکانی ژیانی سەردەمی بەر لە ئیسلام، شانامەی لێ دەرچێ، دیاردەیەکی بەرچاوە. وەنییە ئەم دیمەنە جودایەی شیعری کوردی لەگەڵ ئەدەب و مێژووی فارسی شتێکی ڕێکەوت بێ، بە پێچەوانە، فەرمانێکی واقیع و داخوازیەکی کۆمەڵایەتی لە یەکدی لاداوی کورد و فارسە کە «فیۆداڵ» یەکێکە لە ناوەڕۆکەکانیان: هەرچی فارسە لە سەردەمی فەتحی ئیسلامدا خاوەن حوکم و دەسەڵاتی دین و دونیایی بوو، شاهـ و موبەدەکان و حوکمدارەکان و دەست ڕۆیشتووەکان و فیۆداڵەکان و سەرۆک سوپاکان بە پانایی و درێژایی فارسدا خۆیان بنگەی ئایینی و سوودمەندی زەردەشتی بوون. کورد بە تێکڕایی میللەتێکی ژێردەست بوون تاک و تەراییەکی مڵکداری و فیۆداڵی گەورەی نەبێ لە زەردەشتی وەتەنگ هاتبوون، چونکە لە ماوەی پتر لە هەزارساڵدا دینەکە وەها شێوابوو گیانی هەژاردۆستی تێدا نەمابوو، سەیرێکی «ڤەندیداد» بکە زۆری بووبووە «تقوس» و لە دەست و گەردنی بێدەسەڵاتان دەئاڵا. ئنجا بۆیەبوو فارسەکان کە خاوەن حوکم بوون و سوودمەندی زەردەشتایەتی لە بنگەکانی حوکم و شارەکانیان و فیۆداڵەکانیاندا زۆربوون بەرگریان لە ئیسلام کرد و بۆ دەیان ساڵ لەگەڵیدا جەنگان و بۆ سەدانساڵیش بەرهەڵستیان لێ کرد. کوردە خانەوێرانە ژێردەستەکە لەخوای دەویست ڕزگارکەرێک پەیدا بێت ئیتر لە ماوەی چەند ساڵێکدا سەرلەبەری کوردەواری بوو بە ئیسلام و خێرا ئایینی زەردەشتی لەبیر خۆی بردەوە. تەنانەت بەر لە پەیدابوونی ئیسلام ڕەش و ڕووتی فارسیش کە پشکێکیان نەبوو لە خێر و خۆشی زەردەشتی زۆربەیان بە دووی بانگەوازەی مەزدەکدا چوون، هێندەی نەمابوو ڕێژیمی میراتی وەرگێڕن بەڵام لە ملانێدا تەکانی دواین باری شایەتی و موبەد، موبەدەکانی ڕاست کردەوە.

تەجرەبەی ئیسلام لە فارس و لە کورددا تەجرەبەیەکی گونجاوە لەگەڵ جودابوونی واقیعی کورد لە واقیعی فارس بە خۆیان و ناوەڕۆکی مڵکداری فیۆداڵیانەوە. نووسەرانی سەر بە قەومایەتی فارس لەم ڕۆژگارەشدا دەنووسن و دەڵێن کە بەلای وانەوە فەتحی ئیسلام و ڕەوی جەنگیزخان لە ڕووی

تێبردنی دەسەڵات و سەقافەتی فارسیەوە یەک شتن و گۆیە وەرگرتنی ئیسلامیشیان هەر جۆرێک بووە لە بەردەوام کردنی بەربەرەکانیان دژی ئیسلام. تەنانەت هی وەهایان تێدایە پاتەوپات دەڵێ ئیسلامەتیەکی فارس قبوڵی کرد پێوەندی بە ئیسلامەتی ڕاستینەوە نییە و چەکێکە بۆ لەسەرخۆ کردنەوە لە کاری دەهێنین.

تۆ سەیری چۆن فارسزمان لە هەموو عیراقدا پێچرایەوە لەگەڵ پێچرانەوەی حوکم و دەسەڵاتی، کەچی کوردەکە هەر چونکی پێوەندی بە حوکمەوە نەبوو ئەوەندە فیۆداڵەشی نەبوو لە ڕێی سوودێکی کە گۆیە لە ڕێژیمی فیۆداڵی فارسەوە بۆی هاتبێ بتوانێ ڕوخساری کوردەواری بە بەرژەوەندی دەسەڵاتداری فارس ڕەنگ بکات، بەو پێیە فیۆداڵە کوردەکە خۆیشی بێ تەئسیر و کەنفت بوو، ئیتر هەموو ئەو شوێنانەی کوردنشین بوون لە کوردستانی عێراقدا بۆ کورد مایەوە، تەنانەت بەشێکی ئەو بەتاڵاییەی کە کشانەوەی فارس بۆ دیوی ئێران لە دیوی عیراق بەجێی هێشت، کوردی تێرژا.

ئەسەرێکی جیرانەتی کورد و فارس بەر لە هاتنی ئیسلام بۆ عیراق تا ئێستاش لە گۆرانی ئەڵلاوەیسی و خورشیدی و تێکەڵکێش و قەتار و خاوکەر دەنگدەداتەوە کە لە هەمووواندا زەنگوڵەی ئاهەنگی فارسی هەیە. ئەو گۆرانیانە لەو شوێنانەی کوردستانی عێراقدا هەبووە کە وەختی خۆی جیرانی فارسەکان بوون. ئەگەر شی کردنەوەیەکی دیکە هەبێ گۆرانیەکان بە خۆیان و زەنگوڵەیانەوە بۆ سەرچاوەیەکی دیکە بباتەوە، من لێی بێ ئاگام. بە هەمەحاڵ ئەم گۆرانیانە بەرەبەرە لێمان دەتۆرێن لە بەر کەم بوون وەیا سست بوون وەیا نەمانی دەنگی زەنگوڵەداری بە تەوژم فرکەی وەک دەنگی خوالێخۆشبوی حسێن بەرزنجی. هەرچی دەنگی شادڕەوان عەلی مەردان بوو بەسەر ڕێبازی مەقامشناسییەوە نەک بەسەر تەلی کشت و چریکەداری ژێ دەنگەکانییەوە هاتوچۆی لە ئەڵلاوەیسیدا دەکرد. لە ساڵەکانی بەرەو کۆتایی 1950دا گوێم

له تۆمارکراوێکی ساڵح دیلان بوو، بێ مۆسیقا بە دڵی خۆیی و بۆ دڵی خۆی ئەڵڵاوەیسییەکی گوتبوو لەو پەڕی هەستیاری و کشتی و عاتفیەوە سەرلەبەری سیحر و ئەفسوونی ئەو مەقامە نەمرە گیان هەژێنەی لە تاقگەی زمانە پاراوەکەیەوە هەڵڕشتبوو... بەرپرسەکانی ئاواز و ئاهەنگی کوردی ئەگەر بە دوا پاشماوەکانی دەنگی زرینگەداری ئەو ناوچانەدا نەگەڕێن و مەقامەکانیان پێ تۆمار نەکەن مژدەی مەرگی ڕەسەنترین و گەشترین و پێشکەوتووترینی ئاهەنگی کوردی بە هونەری «چڕین» دەدەن.

لە هەموو لێکدانەوەیەک و بەراورد کردنێک و وردبوونەوەیەکەوە بەو ئاکامە دەگەین کەوا ئەدەبی کوردی وەک نوێژ و تاعەتی کوردی و زانستی کوردی و مارەیی و تەڵاقی کوردی و.. و... کوردی تاکە یەک داوی پێوەندی بە فیۆداڵەوە نەبووە. ئەو فیۆداڵە نەزاوەی کە نەیدەزانی پسوولە ئیمزا بکات و بەحاڵ لە بەیتی عەلی بەردەشانی دەگەیشت چجای بزانی ئەم تەلیسمانە چ دەڵێن:

تۆ دەست بەتیغ و پەنجە بەخوێن سوور و دڵ قەتیل
(لوثیش ثبوتی دعوییە) یا ڕاستە یا درۆ

طوطی‌یی تۆ لە حرصی دڵ طوقی طمع دەکاتە مل
بولبولی من لە عشقی گوڵ تغنیە و و طرب دەکاتە مل

ماڵش دەدەی بەدەم لە دەمی خوابی صبحدم
هەم زلفی قیر گونە و هەم چیهرەیی قمر

ئەوەندەم خاک بەسەردا کرد لە هیجرت
زەمین دووی بوو بە تۆز ئێستێکە پەنجە

هەروەک ئەلفی جانە ستوونی لە سکووندا
نەک تابیعی غەیرە و «متحرک» وەکوو هەمزە

دەگێڕنەوە گۆیە لە دیوەخانی ئاغایەکی کورددا حیکایەتبێژێک چەند شەوان بە حیکایەتی ڕۆستەمەوە خەریک بوو، وەختێک لێی بۆوە ئەو ئاغایە لێی پرسی ئەری کابرا ئەو ڕۆستەمە نێر بوو یا مێ!!

دەمێنێتەوە بگوترێ مەرج نییە ئەسەری پلەی فیۆدالّی یەکسەر بچێتە ناو ئەدەبەوە، ئەوەندە بەسە کە لە تێکڕای باری ئابووری و کۆمەڵایەتیەکی مەحکووم بە فیودالّ بێ و چەژ و ڕاویژ و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ئەودا بگونجێ وەیا تێبخوێنێتەوە و دەنگ و سەدایەکی لە ژوورخاندا ببیسترێ.

ڕاستیەکەی ئەم جۆرە بەرپەرچدانەوە بۆ لایەنی باری ئابووری، کە من بەویش ڕازی نیم، لە ئاست ئەدەب و عەقیدەدا پاشەکشێیەکی کۆڵدەرانە و هەڵاتوانەیە لەو کەسانەی دەیانەوێ کۆمەڵایەتی بە بنەمای ماددی و ئابوورییەوە ببەستنەوە. ئێمە کە قسەمان لە گەرمایی ڕۆژی قرچە قرچی نیوەڕۆی هاوین بوو ناشێ ڕازیبین بە زەردەپەڕی ئێوارەی ڕێبەندان. ئەو هێندە تاووتینە ساردوسڕە کە بەحالّ دەتوانێ پەراوێزێکی شل و شۆقی فشەڵۆک و چاوغەڵەتێن بە دەروی ئەدەبەوە بگێڕێ کەوا نە کەس لەناو خۆی حەپس دەکات و نە کەس لە هاتنە نێوی پاشگەز دەکاتەوە، نابێتە خزمەتکاری تاووتینی هەستپێکراوی لەچاو چەقیوی زەق و زۆپی ئایین کە هەموو هاتنە ناو و دەرچوون لە سنووری، زەنگێکی ئینزار لێدەدا و خۆیی و خەڵقیشی لێ بەئاگا دەکاتەوە.

لێرە بە پێشەوە لەم نووسینەدا ئەم بێ بایەخیەی تاووتینی فیۆدالّ لە ئەدەب و هونەردا بە زۆر باردا قسەی لێکرا تا ئەوەی لزوم نابینم سەرلەنوێ

ڕێچکۆڵەی تازەی لێ دەرکەم بەملا و بەولادا، چەند لاپەڕەی دوایش پێداچوونەوەیەک بوو کە باسی تاووتینی سەرمایە لە ئەدەبی کوردی بە مل نووسینەکەی دابڕیەوە. ئنجا بابزانین دەوری سەرمایە وەیا ئەسەری وەیا تەئسیری بەرەو پێش بردن و بەرەو دوای هێنانەوەی ئەدەبی کوردی لەچاو سەردەمی، بە اصتلاح، فیۆداڵ چی بووە؟

لە پێشەوە دەبێ بڵێم کە بە دوا ئەسەری فیۆداڵ وەیا سەرمایە وەیا ئایین وەیا سەقافەتی بێگانەدا دەگرێین بەدوای میکرۆبدا ناگەڕێین کە دیتنی بە میکرۆسکۆب نەبێ مومکین نییە. چ شتێکی وەکوو سەرمایە وەیا فیۆداڵیەتی کە بەپێی شی کردنەوەی ماددی قۆناغی سەرلەبەر و یەک بەدوای یەکدا هاتووی مێژوو بن و سەرجەمی بوونی ماددی و مەعنەوی کۆمەڵ بە خۆوە بگرن و «ماهیە»ی کۆمەڵایەتی و مێژوو بن دەبێ ئەوانیش هەر نەبێ بە قەدەر دەوری «ئافرەت» کە لەسەدی نەوەدی شیعری چەرخی ڕابردووی بەخۆیەوە خەریک کردووە، لە ئەدەبی ڕابردوماندا ئەسەرییان هەبێ. لەوەشدا گەلێکم بۆ سەرمایە و زەوی بەجێ هێشتووە، چونکە بەپێی دەورە هەرە گرنگەکەی ئابووری و هۆی بەرهەمهێنان کە لە نەزەرەیەی ماددی بە ژێرخانی کۆمەڵایەتی دانراوە، دەبوو عیشقی ئافرەت کەوا نە خاڵقی بەرهەمە و نە نان و گوزەرانە و نە کرێی خانوو و نۆرە ئاوە، لەچاو دەوری پارە و زەوی لەو گۆشە بەرتەسکەی ژوورخانی شیعردا هەر خۆی نەنوێنێ. من کە گوتم شەڕەکانی ناپلیۆن هی ئەو نەبوون و هی «موسیۆ لۆکنت دی فۆتسکاسیۆن» بوون بەوەندە لە خۆم ڕازی نابم جارێکیان ئەو موسیۆیە چووبێتە مۆسکۆ و جارێکی دیکەش ئەفسەر بووبێت لە ئیتاڵیا و لە نماشتێکی پاریسیش بەشدار بووبێ چونکە ئەمانە و دەهێندە هەزار هێندەش بەشی سەد یەکی ئەو دەورە ناکەن کە ناپلیۆن لە شەڕەکاندا هەیبوو. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە دەوری سەرمایە وەیا فیۆداڵ نابێ هەر ئەوە بێ کە ناوێکیان لە شیعردا هاتبێ وەیا تەمایەکی شاعیر پێیان بووبێ چونکە ئەو خاڵقیەتە و خاوەنایەتیەی کە نەزەریەی ماددی بە پلەی مێژوویی و هۆی بەرهەمهێنانی

دەبەخشێ دەبێ لە شێوەی خاڵقیەت و ڕابەرایەتی و مەعبودایەتی لە ژوورخاندا بەدەر بداتەوە ئەگینا دەبێ بڵێین ورچیش دەوری هەبووە لە ئەدەبی کوردیدا چونکە نالی دەڵێ: «خصمەکەی من کل بی ئاهـ گیرە خرسی لاعبە»

کەریش دەوری هەبووە، حاجی دەڵێ:

میللەتیش هێند کەرن وەکوو جاران
دەستیان ماچ دەکەن دەڵێن قوربان

نالی دەڵێ: «هەی کەرێکم بوو چ پەیکەر...»

خولاسە، ناوهێنانی هەرچی شتێک بێ ئەگەر ڕابەر و خاڵق نەبێ، دەبێتەوە بەکارهێنانێکی عادەتی ئەو شتە لە ئاخاوتن و تەشبیهدا وەیا هەر بارێکی دیکەی ئارایشتی ئەدەبی بێ. دین دەوری هەیە چنکە لە ئەدەبدا بۆ خۆی سەرەباسە و ماکی تصورە و سەرچاوەی لێوە هەڵێنجانە. عیشق دەوری هەیە... خاسیەتەکانی هەستیار و پێزان و وروژێن لە مرۆڤدا دەوریان هەیە. کە قەومایەتی و چینایەتی دەبنە ئامانج دەوریان لە ئەدەبدا دەبێ. بەڵام کە ناچار بێت لە جیاتی پارەی تاکسی بە چەند دێڕە شیعرێک مەتحی لێخوڕەکەی بکەیت، تاکسی دەورێکی نییە لە ئەدەبەکەت هەروەک فڕۆکیش دەوری نییە لە حەجی ئەو حاجیانەی سەفەری پێ دەکەن بەرەو کەعبە. دەوری فڕۆک لە سەفەرەکەیدایە نەک لە حەج.

ئێمە کە دێینە سەرباسی پێوەندی ئەدەب بە قۆناخی مێژووییەوە دەبێ لەو تەرزە تێبینیانە با خەبەر بین، ئاگاداری دیاردەیەکی دیکەی زێدە گرنگیش بین کە ئەگەر لێی بەئاگابووین حسابی جودا جودا تێکەڵ بە یەکدی دەکەین... کە دەبینین ئەدەبی سەردەمی سەرمایەداری لەهی سەردەمی دەرەبەگایەتی پێشکەوتووترە هونەرەکە ناگەڕێتەوە بۆ سەرمایە بەڵکوو هی

بەرەو پێشچوونی سەرلەبەری کۆمەڵایەتییە کە لە ڕێی نما کردنی ئاساییەوە بە سەرمایە و زانست و هونەر و فەلسەفە و ئەدەب و عەرەبانە و خەتی شەمەندەفەر و چاپەمەنی و مۆدێلی جلک... و... و... هەرچی لە کۆمەڵایەتیدا قابلیەتی گۆڕان و پێشکەوتنی هەیە، بەرەو پێش بۆتەوە. تەنانەت پاشماوەی دەرەبەگ و ملّکداریش کە دەسەڵاتی سیاسیان دۆڕاندوە ئەوانیش بەرەو پێش دەبنەوە. وا ڕێک کەوت داهاتن و دۆزینەوەکانی زانستی و بەرەو ژوور چوونی ئامێرەکانی گوێزانە و بەیەکدی گەیشتن و هۆیەکانی بەرهەمهێنان و پەرەسەندنی خوێندن گەشەی هونەر بە تێکڕای لە سەرەتای Renaissance ـەوە کە لە شەڕی نێوان فکر و خەفە کردنی فکر و ئازادی بەوەلەد بوو، ئەمانە هەمووی بوونە هاوڕێی کۆتاییەکانی تەمەنی فیۆداڵ و سەرەتای فراژی بوونی سەرەمایەداری دەسەڵاتی شارستانشینەکان لە ئەورووپادا تا سەری گەیاند بە شۆڕشی فەرەنسە.

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە هۆیەکی زێدە گرنگی ئەم بووژانەوەیە فەتحی ئەستەمبۆڵ بوو لە لایەن «محمدی فاتح» ـەوە کە دەرگەی لە خەزنە فکری و زانستیەکانی ژێر زەمینەکان کردەوە و بەرەو ڕۆژئاوا سەفەریان کرد... حەپس بوونی ئەو کتێبانە هەزار ساڵێکی پتر خایاند خێرا بە خێراش دوای ڕەهابوونیان شەڕی نێوان فکر و دوژمنەکانی تیژ کرد. کۆپەرنیکۆس و گالیلیۆ بەرهەڵستیان لە فیۆداڵ نەدیت، کەنیشتە لەگەڵیان بەشەڕ دەهات.
کۆلۆمبۆسیش بە یاریدەی سەرۆکی فیۆداڵی ئیسپانیا دژی ڕاوێژی قەشەکان بەرەو ڕۆژئاوا سواری شەپۆلەکانی ئەتلەنتیک بوو. هەرچی هەڵمەتێکی زانستیانە لە ئەورووپای پێش شۆڕشی فەرەنسە لەو ڕۆژگارانەدا بوو بێت قەشەکان فریشتەیان بەرەنگار کردوون نەک فیۆداڵەکان.

ڕاستیەکەی بووژانەوەی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا وەک مەلۆتکە بە مامانەتی «فکر» لە منداڵدانی جەنگی نێوان ڕۆشنایی و تاریکایی کەوتە کۆشی مرۆڤایەتیەوە. بووژانەوەی دەسەڵاتی شارستانشین و بنگە مالیەکان و

ئابووریەکانیش «ئەنجام» ی ئەو شەڕە بوو نەک «هۆ» . ئەو «فکر» و ئەدەبەی کە ڕێگەشی بۆ سەرمایە و شارستانەتی خۆشکرد هەر خۆی بوو دواتر بەردەوام بوو لەسەر بەگژداهاتنەوەی «دەسەڵاتی نویێ» کە پێی دەگوترێ سەرمایەداری. هەڵەی گەوەرتر لەو هەڵەیە پەیدا نابێ کە بگوترێ ئەدەب و هونەرو زانستی سەردەمی سەرمایەداری لە ئەورووپادا خزمەتکار وەیا لە سەرەتاوە زادەی سەرمایەیە.

کە بابدەینەوە بەرەو کوردستانی خۆمان دیاردەی «ڕێنێسانس» لە وەهم و خەیاڵیشدا پەیدا نەبووە. لە ولاتە موسڵمانەکاندا، بە پێچەوانەی وەزعی ئەورووپا، زانست و دین یەک سەرچاوەیان هەبوو ئەویش مزگەوت. لەبەر ئەمە ئەو شەڕەی لە نێوان کەنیشتە و زانکۆکان و بنگە سەقافیەکانی ئەورووپادا بەر لە 300-400-500 ساڵ بەرپا دەبوو لە نێو موسڵمانانندا ڕێی بەرپابوونی نەبوو چونکە لە سەردەمی عەباسیەکان کە دەستکرا بە وەرگێڕانی زانست و مەنتیق و فەلسەفەی یۆنان بۆ عەرەبی تێک هەڵقژانێک لە نێوان دیندارەکان و دەستەی مەنتق و فەلسەفەو... و... ڕوویدا و زۆری نەبرد کێشایەوە سەر تێکەڵبوونی دین و زانست، ئەو کەمتاکورتە کەمئیمانانەش کە دەمیان لە زانست و فەلسەفە دەدا و ڕەخنەیان لە دین دەگرت بێشوێنەوار مانەوە.

بە هەمەحاڵ ئەوساش شەڕی نێوان نوێ و کۆن لە ئیسلامدا دەخلی بەسەر ڕێژیمی ئابوورییەوە نەبوو، دواتریش کە مەسلەتی کرا لە نێوانیاندا سەرۆکایەتیی دەوڵەت و ڕێژیمی سیاسی لە نیگایەکی بەرەو فرەوانییەوە دینی لە قەبەڵ زانست کرد، وەیا زانستی لە قەبەڵ دین کرد، ئەگەرنا نەدەشیا بەغدا بۆ ماوەی 700-800 ساڵ بەر لە ئەورووپا بەهرە لەو زانستانە وەرگرێ. ئنجا کە بازێک بهاوێژین بۆ کوردستانەکەی سەدەی بیستەم و بە چاوی مامڵەت سەیری پێوەندی ئەدەبی کوردی بە سەرمایەوە بکەین و پرسیار بە دەوری تین و تاوی سەرمایەدار بۆ ناو ئەدەب هەڵستێنین، زۆر

بەسەیری، وەڵامی ئەو پرسیارە زل و زەبەلاحە بەیەک وشە دەدرێتەوە ئەویش: هیچ!! بەڕاستی لە وەهم و ورێنەشدا سەرمایەی کوردی دەخلێکی بەسەر ئەدەبی کوردیەوە نەبووە نە بەچاک نە بەخراپ.

جارێ با لە پێشەوە بڵێم ئەم باسەی نەبوونی پێوەندی ئەدەبی کوردی بە سەرمایەی کوردیەوە نوکتەیەکم بە بیر دەهێنێتەوە: دەڵێن لە شەڕێکدا یەکێک لە تۆپچیەکان بە درێژایی هەراکە خامۆش مایەوە، دواتر سەرۆکەکەی لە شێوەی محاکەمەدا لێی پرسی بۆچی تۆپی نەتەقاند بەرەو دوژمن: گوتی گەورەم سەدویەک سەبەبم بەدەستەوە بوو... یەکەمیان ئەوەبوو کە دانە تۆپم نەبوو. دووەمیان... سەرۆکەکە گوتی ئەوانی دیکە لزومیان نییە. سەرمایەی کوردیش پەیدا نەبوو بوو تاکوو شوێنەواری لە ئەدەبدا هەبێ. تا ئێستاکەش کورد نەگەیشتۆتە پلەی ئەو سەرمایەداریەی کەوا بەر لە 1000 ساڵ لە «ڤێنیس و جەنەوە» ی ئیتاڵیادا تجارەتی جیهانی دەگێڕا. من لە شوێنی دیکەدا گوتومە دیاردەی «نزیف اقتصادی» لە ماوەی 2500 ساڵدا نەیهێشت سەرمایەی کوردی پەیدا ببێت، لێرەشا دووبارەی دەکەمەوە. ئنجا ئەگەر لەبەر خاتری بەلاوە نانی دەمەتەقە دانیش بە هەبوونی «سەرمایە» ی کوردیدا بهێنم خۆ ئەو سەرمایەیە بە عومری خۆی خاوەن دەسەڵات نەبووە، تیشکێک بۆ لای ژوورخانی «عەقلی، دەروونی» ئەدیب و هونەرمەند بهاوێژێ.

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی گرنتریشەوە شیعری کوردی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا درێژەکێشانێکی شیعری سەدەی نۆزدەم بوو چ لەلایەن ڕووخسارەوە بێت و چ لە لایەن ناوەڕۆکەوە. تەنانەت شیعری حاجی قادریش بۆ ماوەی بیست و چەند ساڵێک دوای مەرگی، تا کۆتایی شەڕی یەکەم، کەسی بۆ قەومایەتی بە دەنگ نەهێنا لە شیعردا. وەک دەبیەم یەکەم شیعری قەومی پاش حاجی قادر ئەم چەند بەیتەی پیرەمێردە کە لە سەرتاکانی 1920دا گوتوویەتی:

کچانمان لە ژێر بەیداغی ڕەشدا
چاو هەڵنەهێنن بە خوێنی گەشدا

کوڕانمان هەموو بە ورد و درشت
لە ڕێی ئازادی خۆ نەدەن بەکوشت

ئازادی نابێ سەربەستی نابێ
ئازادی دەبێ هەر خوێن بەهابێ

ئنجا ئەگەر خەبەرەکە وەیا دەقی بەیتەکان هەڵەی تێدا بێ بم بەخشن.

بەڵام ئەگەر حاجی قادر هەموو دنیاشی بەدەنگ هێنابایە دەخلێکی نەدەبوو بەسەر پارە و سامانەوە. چاوێکیش بە شیعری سەدەی نۆزدەماندا بگێڕیت لەوێش سووکایەتی پارە و سامان بەلای شاعیری کوردەوە دەخوێنیتەوە تەنانەت بچۆوە بۆ هەزار ساڵیش لەمەو بەر شاعیری موسڵمان هەر زەمی دونیای کردووە.

کە بێینەوە بۆ لای شاعیری نوێخوازی کورد کە هەستی کۆمەڵایەتی و قەومایەتی وەیا چینایەتی بە جووتە تێدا بزووتوو بوو دەبینین وەک ئاگر لە عومری زەویدار و کەشیدەدار و... و... بەردەبوو تەنانەت لە دژمانیەتی شتی کۆنینەدا گەیشتە ڕادەی بەلاوە نانی قاڵبی شیعری تەقلیدی کە عەرووزە، ئنجا ئەگەر دوژنایەتیی ملک و سەرمایە بدەینەوە بە حسابی تاو و تینیان بۆ ناو ئەدەبی کوردی ئەوسا پێوەندیان دەچێتە ڕیزی پێوەندی دیموکراسی بە دیکتاتۆرایەتی وەیا هی بەرخ بە گورگ. دژمنایەتیی ئەدەبی نوێی کورد لەگەڵ ڕابردوو بەلای هەندێ تاقمی ڕۆشنبیرەوە گەیشتە ڕادەیەک کە لە بیروباوەڕی نووسراویاندا وەها ڕادەنوێنن گۆیا سەرنەکەوتنی شۆڕشەکانی کورد دەچێتەوە بۆ سەرۆکایەتی ئەو شۆڕشانە کە بریتی بووە لە فیۆداڵ و ديندار. بەڵام پێشمان ناڵێ پرۆلیتاریەکەمان لە کوێ خەوتبوو؟ دەنگێکی لەبەرەوە

نەهات؟ لەخۆوە پەلامارێکی نەدا؟ بەهەمەحاڵ لێرە کارمان بەو پرسیارانەوە نییە هەرچەند بە سەهوو چوون لەو تەرزە بەدیهیانە لە لایەن ئەوانەی بە خەباتەوە خەریکن دەکێشێتەوە بۆ خانەوێرانی.

ڕاستیەکەی دڕدۆنگی نوێخوازەکان لەوەی پێی دەڵێن «میراتی» وەها بەلای ناواقیعیەتەوە ڕۆیی گەیشتە پلەی جووتەوەری (ازدواجیە) کە دەماندیت لە نووسیندا لەشی فیۆدال و پارەدار بە نووکە چەقۆی ڕق و غەزەبی ئەدیبەکانمان ئەنجن ئەنجن دەکرا کەچی بە زۆریش دەستیان لە ئالایشی مێزی ئەو «زۆردارانە» چەور دەبوو. هەمیشە دەمان دیت شۆڕشگێڕی بیست ساڵەیی کە نمایشتی دڕەندە و بڕندەی دژی «چەوسێنەرەوە» دەگێڕا، لە مناسەبەدا چایە و قاوەی لە دیوەخانەکانیان دەگێڕا... ئەمەش ئاکامێکی ئاساییە لە تێکەڵبوونی واقیعی شەپرەلێداو و نەزەریەی تیژڕۆ لە بۆتەی فکری شلکدا. بەڵام نەگەیشتنە جێی هیچ یەکێک لەو تەمایانەی نوێخوازی کورد بە ئومێدیان بوو، بووە هۆی دامرکانەوەی ڕق و بوغزی بەشێکی ئەدیبەکان و تا ڕادەیەکیش لە تێکڕای ئەدیبەکانەوە جۆرێک ڕێزنان لە کەلەپوور دەرکەوتووە.

بە هەرحاڵ ئەدەبی نوێی کوردی کە لەسەرەتایەوە بە تەوژمەوە بەرەنگاری باری سیاسی – ئابووری بووە، بەخۆیی ئایدۆلۆژییە سەربە چەپیەوە هەمیشە دوژمنانە سەیری ئەو دەسەڵاتانەی کردووە کە بە دۆستی دانەناون ئیتر زەویدار وەیا دیندار وەیا وەزیفەدار... دیارە دوژمنایەتیش ئەو پێوەندیە نییە کە نامەکەی کاک ئەمیر لێیەوە دەدوێت دەنا دەبێ بڵێین ئەدەبی سۆڤیەتیستانیش پێوەندی بە ئیستعمارەوە هەیە.

بەر لەوەی دەست لە نووسین هەڵگرم چەند ڕوون کردنەوەیەک بە پێویست دەزانم نەکا تەمومژێکی بە سەهووبەر لەمەبەستەکانم بئاڵێ:

1- له ئاست سیاسەتی بەرەی دەوڵەتە سۆسیالیست وەیا کۆمۆنیستەکاندا من چ گلەییم نییە بە دڵیشمدا نایەت نەزەریەکانیان لێبکەمە کێشانە و پێوانەی ڕەفتاریان چونکە دەزانم «دەوڵەت» هەتا بڵێی جودایە لە «نەزەریە»... واقیع هەتا بڵێی جودایە لە خەیاڵ... من تەنها لە حاڵەتێکدا بۆ مناقەشە نەزەریەکەیان لێ بەخەبەر دەهێنم کە ناچاربم ڕەفتاریان هەڵسەنگێنم ئەویش لەو بارانەدا دەبێ کە دۆستەکانیان بە خۆڕایی و بێ لزوم لەسەر ئەو هەڵوەستانەیان بکەنەوە کە هی پشتگیری لێ کردن نیین بە تایبەتی لە لایەن میللەتی وەکوو کوردەوە کەوا بەحاڵ دەتوانێ یان ناتوانێ پشتگیری لە خۆشی بکات، لە کەسیشەوە پشتگیری لێ نەکراوە.

2- کۆمۆنیستی کورد ئەگەر با بدەنەوە بەرەو ئامانجەکانی قەومایەتی و چارەنووسی نەتەوایەتی کورد، بادانەوەیەک کە پێداویستی بیروباوەڕێکی تازەیان بێ، لە هەموو تاقمێک زیاتر دەتوانن خزمەتی کورد بکەن چونکە هەم پێوەندی دۆستایەتییان بەملا و بەولادا شریتەی کێشاوە هەم پتریش لە خەلق قسەیان لێ دەسەلمێندرێ.

3- روخسەتم بە خۆم داوە، لە زەمینەی بێ مەبەستیەوە، بە دڵی خۆم و بەو شێوازەی خۆی بەسەر تەعبیردا دەسەپێنێ، بدوێم. لەم مەیدانەی تەعبیریشدا نووسەر و بیریارە زلەکان گوتەی وەها بڕندە و بێباکانەیان بەکار هێناوە ببێتە شەرمشکێنەی قەڵەمێک کە قسەکانی لە شەخسیەتی هیچ کەسێک نادوێن.

4- من کە دێم لە گۆشەی بێلایەنییەوە سەیری ڕووداوەکانی مێژوی ڕابردوو دەکەم و چاکە و خراپەی کۆمەڵایەتی لێرە بە پێشەوە دەدەمەوە بە پێوانەی سەردەمی خۆی گەلێک پتر لە بیریارە

ماددیەکانی سەدەی نۆزدەم و ئەم سەردەمەش لە زوڵم و زۆرەوە وەتەنگ دێم، هەرچەند نە من و نە کەسیش دەتوانێ بە وەهم و وڕێنەش بەرهەڵستیان لێ بکات.

ئەبوو زەڕڕی غەفاری بەر لە 1300 ساڵ گوتوویەتی «عجبت لرجل لا یجد القوت فی بیته ثم لا یشهر سیفه علی العالم - پێم سەیرە بابایەک نان لە ماڵەکەیدا شک نەبات و شمشێر لە ڕووی دنیا هەڵنەکێشێ». بڵێن چی بەرانبەر بابایەکی بەر لە 100 ساڵ و 1000 ساڵ لە برسان مردووە و شمشێریشی هەڵنەکێشاوە. بۆتە عەبد و هەڵنەگەڕاوەتەوە. بوتی لە قوڕ دروست کردووە و سجدەی بۆ بردوە. قسەی ڕۆشنبیرانەی بۆ کراوە و کەوتۆتە دووی شەعبەدە. بڵێین چی!!

من دەست بۆ ئەو ڕووداوانە درێژ ناکەم بیانشێوێنم، هەروەک ناز و فیزی دەنگ دلێر و زار قەڵەباڵغی ئەم سەردەمەش بە ڕەوا نازانم، چونکە شێواندنی ڕاستیەکانی مێژوو سوود بە میللەت ناگەیەنێ، بە ڕەوا زانینی ناز و فیزی ئەم سەردەمەش لەبەر ڕەنگ و بینێکی قەومایەتی وەیا چینایەتی لە خۆی هەڵسووبێ هەر دەبێتەوە تێ چوونی مافی جەماوەری بێدەسەڵات. چ عەبدایەتیی «بلال الحبشی» بەر لە 1350 ساڵ ڕەوا دیترابێ چ نازی سەرۆک ڕێکخراوی ئەم سەردەمە ڕێزی لێ بندرێ هەر دەکێشێتەوە بۆ چەماندنەوەی قامەتی مرۆڤایەتی. من دەڵێم با مەردبین و دەسدرێژی لە عەمەلە و فەلاح و کاسبکار و خوێندەوار و کەڕەوار و تێکڕای بێنەوایان نەکەین و مافی بەکارهێنانی قەناعەتیان پێ بدەین چ لە ڕۆدیسیا بێت و چ لە ڕووسیا و چ لە بیتوێن و چ لە چبایش.

5- ئەم نووسینە لە تاکە سەرچاوەی دەروونی من زەنە دەکات، پێوەندی بە هیچ کەس و لایەنێک و مەبەستێکەوە نییە، لە خزمەتی ڕاستی و کوردایەتی بەولاوە، ئەویش بە پێی بڕ کردنی هۆش و هەستم.

باوکم گوتوویەتی:

بستێکی لە خاک و عەردی کوردی
نایدەم بە مەرقەدی سوهرەوەردی

بەلای منیشەوە قودسیەتی کوردایەتی وەک قودسیەتی فەلەستین بەلای عەرەب و قودسیەتی ڤۆلگۆگراد بەلای ڕووسەوە ژووی هەموو شتێک دەچێتەوە. ڕەنگە لەمەدا هێشتان مافی تەواوی کورایەتییم بەکار نەهێنابێ چونکە من کە بێم لە بەراورد کردندا «کوردایەتی» بە «ڕووسایەتی» بگرم و لێی تێ نەپەڕێنم حیسابی زەعیفی کورد و هێزی ڕوسم لەبیر خۆم بردۆتەوە کە هەرگیز نابێ لەبیر بچێتەوە، چونکە پێویستە بەزەیی مرۆڤ بۆ مرۆڤی لێ قەوماو پتر بجووڵێ. ئەگەر کورد هێندەی ڕووس بەهێز بووبایە ڕووسیش وەک کوردی ئێستاکە ببایە، ویژدان لێی داوا دەکردم پەرۆشم بۆ ڕووس گەلێک گەلێک پتر بێ لە پەرۆشی ئێستاکەی ڕووس بۆ کورد. ناوی ئەو میللەتە بەهێزانەی پێیان دەگوترێ ئیستعمار لێرەدا ناهێنم چونکە تاکە کوردێک شک نابەم زمانیان بە چاکە لێ بگێڕێ تاکە خەباتکەرێکی کوردیشم نەدیتووە لەعنەتیان لێ نەکات. باسی شەیتان لە زەمینەی سۆزی مرۆڤایەتیدا جێی نابێتەوە.

کاکە ئەمیر!

نازانم لە کوێیت! چۆن نامەت پێ دەگات! لەو بەینەدا کە پێنج ساڵ بەسەر نامەکەتدا تێدەپەڕێت بیروڕات سەری بە چییەوە ناوە! لە هەرای پاش ڕمانی شایەتی ئێران چ هەوارێکت بۆ خۆت پەسەند کردووە! من لە ڕاوێژی قسەکانت ئارداوێژی ماددی مێژوویی و جەدەلیم ڕەچاو کرد، ئنجا ئەگەر چاوم هەڵەی کردبێ داوای بەخشین دەکەم نەک لەبەر ئەوەی، خوا نەخواستە، من باوەڕهێنان بە ڕاڕەوی جەدەلی عەیب دار بکەن بەڵکوو لەبەر ئەوەی بێ لزوم لەو هەموو ڕووپەڕانەدا وتوێژی ڕەخنەگرانەم ڕووی لە نامەکەت کردووە. بە هەمەحاڵ لە لای خۆمەوە موژدەی بەخشینت بەخۆم دەدەم. لە هەڵوەستی ناچارییەوە ئەم نووسینەت بۆ بەڕێ دەکەم بە قاسیدی ڕۆژنامەی «العراق» دا کە هەفتانە ڕۆژێکیان زمانی کوردانەی تێدا دەگەڕێ و کەلەبەرێکی لەیەکدی بێ ئاگایی دەگرێ، بەڵکوو نووسینەکەم وەک ڕاسپاردەی ناو شووشەی بەدەمەوانە کە دەدرێتە شەپۆلی دەریا، ئەمیش بگاتە کنارێک بەندەری تۆی لێوە نزیک بێ... سپاس بۆ تۆ و نامەکەت و ڕۆژنامەی عیراق کە هەلی دەروون کردنەوەتان پێ بەخشیم.

بەدیار ئومێدی هەڵکەوتێکەوە کە بە دیتنت گەش ببمەوە وەیا دەنگ و سەدای خۆشیم پێ بگات، بە ڕێز و سۆزەوە، دەستی دوعاخوازی و ئاواتی تەمەنی درێژ و کامەرانی و بەرزیت بۆ هەڵدەبڕم.

«...»